زنجیرە چاپ کراوەکانی رێکخراوی باوەڕیو کلتوری

رێکخراوی باوەر و کولتووری

# مافی ژیان لە پەیامی خودا

خۆکوژی
پەنهان کوژی
ڕەشەکوژی
تیرۆر
دیل کوشتن

لەژێر رۆشنای قورئان و سونەت

نوسین و لێکۆلینەوەی
ماموستا زانا خەیام ٢٠١٦

# مافی ژیان

# لە پەیامی خودا

### خۆکوژی – پەنهان کوژی ـ ڕەشە کوژی – تیرۆر – دیل کوشتن

## لەژێر رۆشنای قورئان و سونەت


لە نوسینی

ماموٚستا زانا خە یام


٢٠١٦ز - ١٤٣٧ ك

ناوی کتێب : مافی ژیان له پەیامی خودا

بابەت : لێکۆلینەوە

نوسینی : مامۆستا ملا زانا خەیام

تایپ : سیما عمر

پیت چنین : ملا کاروان باوەری

دیزاین : مامۆستا بەیان

سالّی نوسین :٢٠١٠

سالّی چاپ :٢٠١٦

تیراژ :١٥٠٠ دانه

نرخ : دیاریه

ئەرکی چاپ : دەزگای باوەری وکەلتوری

M - 07511140181

zanaxayam@yahoo.com

**پێشکە شە:**

- **بە خوالێخۆشبوانم** ........................
- **پێشکەشە بە ئەندامانی ڕێکخراوی باوەڕی وکەلتوری**
- **پێشکەشەبە فەقێ یەکانم**
- **بەخۆشەویستەکانم**
- **بەهەموو ئەو کەسانەی یارمەتیان داوم**
- **پێشکەشە بەسەرجەم دەستەی خوشکانی باوەری و کەلتوری**
- **وەپێشکەشە بەوکەسانەی کەتێم دەگەن**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

{...مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا ......سورةتی المائدة ( ٣٢)

واتە :

( ئەوەی کەسێك بەناحەق بکوژێت یان گەندەلی و شەڕانگێزی بۆکوشتارلەسەرزەویبلاّو بکاتەوە، وەك ئەوەوایەکەهەموو خەڵکی کوشتبێت، هەروەها ئەوەی کەسێك دوورخاتەوەلەمردن وەك ئەوەوایە کەهەموو خەڵکی دوورخستبێتەوە لەمردن )...

## پێشدەست:

لەم نامیلکەیەدا دەمەوێت تیشک بخەمە سەر هەندێک بابەت کە لەبەر ڕۆشنایی قورئان وسوننەت و تێگەیشتن لەشەریعەتی خوا، پێچەوانەی ئەم بیرو هەستەی کە ئێمە تێ ی گەیشتوین

وەک

١. ڕێگەدان بەخۆکوژی لەشەریعەتی خودا!

٢. ڕێگەدان بەکوشتنی خەلک بەناوی(کفر) ، ئیسلام وئیماندارو بێ ئیمان.

٣.ڕێگەدان بەکوشتنی(جەماعی) ڕەشەکوژی تێکەڵکردنی چاک وخراپ.

٤. ریگەدان بە پەنهان کوژی (غەفلەت کوژی)لەگەل دووژمنانی دین.

٥. تیرۆر .خۆسەپاندن لەئیسلام.

٦. خوێن دەچێتە نێوان (کافر و مسلم)....

٧. مامەڵەکردن لە گەڵ ( دیل )

# هۆی نوسینی ئەم نامیلکەیە:

ویستم لەڕێگە ئەم نامیلکەیە تۆزێك بەر چاوی خەلك روون بکەم کەئیسلام دووره لەهەموو خوێن رشتنێك.

چونکە لەم سەردەمە بەر چاومان دەکەوێت کەهەموو کوشتنەکان وتاوانەکان دەخرێتە ئەستۆی ئیسلام.

وە لەو ناوچەی کە ئیسلام نشینن کێشەو گرفت و کوشتنی زۆر تێدایە؟!

بەدڵنیاییەوە ئەمە نەیارانی (ئیسلام)ن ،کەفیتنەو ئاشوب دەخەنە وەلآتی موسلمانان بۆناشیرن کردنی ئیسلام و پەیامی خودا من لێرە کوشتن روون دەکەمەوە کە خواو پێغەمبەرەکەی درودی خوای لەسەر

چەندە رێگری کوشتنی مرۆڤن بەبێ باوەرو بڕواداریشەوە ،،،،،

## پێشەکی:

لەپێشەکی نوسینی ئـەم نامیلکەیەدەمـەوێت ئـەوە بڵـێم کەئێمـە بـە ڕواڵـەت سەیری دەقـەکان دەکـەین ، بـە هـیچ شـێوەیەک گـوێ نادەینـە فەلسـەفەو حیکمەت و بیرو بۆچوونی دەقەکان، وەک ئەم (بۆقەی) کە لەنێو بیردایە بەقـەد دەرگای بیرەکە ئاسمان دەبینێ بۆیە وادەزانێ کە گەردوون بریتیـە لـەم تـۆزە ئاسمان و ئەم چوار چێوەی تێیدا دەژیت بەلأم گەر بچـینە نێـو قـولایی جیهـان شتێکی ترە.

کەسەیری بیرو باوەری ئاینێک دەکەین، هەردەم ئەوە دەبینین کـە بـە دڵمـان نیە.

یان کە بۆچون وبیرێکی نوێ دێتە ئاراوە دەچیتە نـاو پرۆگـرام بیرلەچـاکی ئـەم هەنگاوە ناکەینەوە بەلکو سەیری ( سلبی ) یەکانی دەکەین.

چونکە لەناخی خۆمان بریارمان داوە کە هەرگیز قەناعەت نەکەین .

زۆر ئەستەمە تۆ (( قەناعەت بەمرۆڤێک بهێنی کەسوێندی خـواردوە قەناعـەت نەکات ))! من خاوەنی دایکێکی نەخوێندەواری وریـا بـوم ئـافرەتێکی رۆشـنبیرو کۆمەلایەتی بوو هەرچەندە کەمن خاوەنی چەند بڕوانامەیەکی بواری دەروونـی بووم

خاوەن کتێب ونوسینی دەروونی و (NLP ) بووم کەچی سەرسامی سایکۆلۆژی وبیری دایکم بووم کەچەندە دەروون ناسە..

بە هەموو هەڵسوکەوتێکی بەرامبەری دەزانی .زۆر جار بەبیرم دە هاتەوەکە کارێك بکەم، بەڵام دایکم زوترپێی گوتوم ، (( گەربەتەما ی کارێکی ئاوای باشتروایە نەی کەی ))، بەراستی پێشهاتی جوانی هەبوو کەسەرسامی کردبووم..

ئینجا دایکم زۆرجار تانەی لە باوکم دەدا گەر پێویست با هەنگاوێکی نوێ بهاوێ، وە باوکم گەر رێگربایە یان بە قسەی نەکربا یان ،بیانویەك ریگربا دەیگوت: بەلێ ( سەیارەکڕاو وەر گەڕ ))!

زۆرجارئەمەم لەدایکم گوێ لێ دەبوو بەباوکمی دەگوت منیش ڕۆژێك گوتم دایکە ئەم مەسەلەیە چیە گوتی باوکت ساڵانی هەشتاکان تازە تۆزێك پارەی پێکەوە نابوو حەزی دەکرد سەیارە بکرێ باپیریشت پیاوێکی خۆگربوو ..

ماران گەستەی ئابووری بوو زۆرجارتوشی قەیران هاتبوو لەرۆژگار، توشی کەم دەرامەتی ببوو..

بۆیە کە باوکت دەیگوت سەیارە دەکڕم باپیرت دەیگوت: باشە گەر (دەعمت کرد)

یان وەر گەرای بەچی چاکی دەکەیتەوە؟!!!

لێرە مەبەستم لەم چیرۆکە ئەوە بوو کە ئێمە هەردەم لەهەموو سـەر هەڵـدان و بیرو ڕاو داهێنانێکی نوێ دا دژایەتی دەکەین بیر لـە ( سـلبیاتی ) داهێنانەکـە دەکەینەوە سودەکەی پشت گوێ دەخەین ..

دیارە سروشتی مرۆڤە کان وایە ئێمە دەزانین (کەسە یارە) دەبێتە هۆی لـەنێو چـونی کۆمـەلێک مـرۆڤ بـەهۆی ڕووداوی خۆپێکێشـان ، کەچـی لـەبیرمان نیـە کەئەمرۆگەرسەیارە نەبێت هەموو کارو چالاکیەکان دەوەستێن..

ئایە دەکرێت ( لە ترسی سوتا نی ماڵ دەست لە سودی شقارتە هەلبگرین )؟!

بێگومان نەخێر ..

من زۆر جار بەعەقلی خەڵک پیێ کە نیوم- وە لە ناخـەوەش گریـاوم بـۆ بـیری پوچی ئەم خەڵکە..

کەنیعمەتی خودا لە پەلە هەورێک دا دەبینن!!

زۆر جار لە خەڵکم بیستوە گوتو یانە ئەرێ مامۆستا شـیعە کـافرنین؟ گوتومـە بۆ؟ گوتو یانە لەبەر ئەوەی نوێژ دەکە ن قاچیان ناشۆن بە ڵکو تـەنها دەسـتی پێدادێنن، هەر چەندە هیلاک بومە لەو وەڵامەو وەڵامی هەزار قسـەی پوچـی تری وا .

بەڵام بەهەر شێوە یەک بێ گوتومە گەرتۆ شیعە بەکافر دەزانیت لەسەر ئـەم ڕفتارە ئەوەباش بزانە ئەم ڕەفتارە پیێ ی دەگوترێ ( مسح ) ی قاچ .

مسح کردن موسلمانی پیێ کا فر نابێت ..

بەڵکو زۆر سروشتیە کەهەر کە سێک مسحی قاچ بکات لەجیاتی شۆردن .

چونکە خـوای گـەورە دەفەرمویـەتی { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ وَإِنْ كُنْتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ مِنْهُ مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ حَرَجٍ وَلَكِنْ يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ }[(١)] ... مامۆسـتا یـەکی هـاورێم هەیـە لـەبارەی زانستەوە زۆر پڕ زانستە بەتایبەت لە زانستی شەرعی وەکو بزانم ئێستا خاوەن زیاتر لە (٧٠) کتێبی چاپ کراوە هەندێ لەم کتێبانە دەگەنە شـەش بـەرگ لـە کتێبێکی خۆی بەناوی (عقیدەی ئیسلامی)..

باسی بەسە رهاتێک دەکات دەڵێ رۆژێک نوێژم دەکرد لەمزگەو تێک لـەپاش نوێژ گە نجێک هاتەلاّم گوتی مامۆسـتا کـە نوێـژت کـرد لـەکاتی (تـەحیات ) خوێندن بۆ پەنجەی شەهادەت نە دەجولاند خۆ فەرمودەی سحیحی لەسەرە .. دەڵێ گـوتم راسـت دەکـەی فـەرمودەی پێغەمبـەر لەسـەر هـەر دوو بـاردا هەیەلەجو لاندن و نەجولانی — واتە چ بیکەی یان نەی کەی وەک یەکەو کێشە

---

١- سورەتی (المائدە) ئایەتی( ٦ )

نيه نابێته کەمتەر خەمی له نوێژەکه .

بەڵام پێم بلێ تۆ چیت خوێندوه له زانستی شەرعی  گوتی ئەوەی راستی بـێ دوومانگ دەبێ چومەته خویند نی زانستی شەرعی تـازه خـەریکم، مامۆسـتا کەم پەرتوکێك ( سيپاره يەکم ) پێی دەلێت - گوتم باشـه بەمامۆسـتا کـەی خۆت بلێ. ئیمان و ئیسلام له دڵەوه دەست پێ دەکات نەك لـه پەنجـه تـا ببێتەمایەی مشتومڕی ئێمه".

ئینجـا بۆیـه دەبـێ {مامۆسـتاکان فێـری دڵ جولانمـان بکـەن نـەك پەنجـه جولاندن} ..

گەر مرۆڤ خاوەنی زانسـت بـوو لـەدین و ژیـن تـێ بگـات ئـەو کاتـه ده زانـی حیکمەت و فەلسەفەی دین لەگەڵ ئەوه دا نیـه کـەتۆ بـەدەقێکی قورئـان یـان سوننەت (حکـم) بەسـەر خـەلکێك دابـدەی کـه شایسـتەی  ئـەم تێـر وانـین و حوکمدانه بێت.

سەیرەخەلك بەناوی دین  ده کوژرێن یان تیرۆر و پەنهان کوژ دەکرێن که دین و ئاینی ئیسلام دژی ئـەم رفتـاره یـه.ئەمـه سـتەمه لـەئاینی پـیرۆزی ئیسـلام دەکرێت ..

ئینجا یان لەلا یەن  نەیارانی ئیسلام هەڵ خەڵەتاون یان به هەڵه له ئیسلام حالی بوون یان به کرێ گیراوی  دوژمنانی دین و ژینن...

ئینجا من له‌م نامیلکه‌یه به به‌رگری کردن له کوشتن کۆمه لێـك مـاف و ڕێـزی مرۆڤ ده‌خه‌مه به‌رچاو له‌به‌ر ڕۆشنایی قورئان و سوننه‌ت .

وه له‌به‌ر نه‌بونی سه‌رچاوه له‌لام که‌متر بایه‌خم به‌سه‌ر چاوه داوه به‌ڵکو ئـه‌وه‌ی له‌فه‌رمووده‌ی خودا و پێغه‌مبه‌ر هاتوه له‌سه‌ر ئه‌وه دواوم چونکه ئه‌وه بۆ ماوه‌ی (١٠) مانگ زیاتره له‌خه‌لوه‌تێکی ئیجباریدام...

زانا خه یا م

٢٠١٠/١٢/١٥

قال تعالى" وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ ..........."الشعراء١٨٣

## خۆ كوژی

## «ڕەشە كوژی — پەنهان كوژی»

سەرەتا گەر ئیمە باسی تـیرۆر و كوشـتن بكـەین دەبـێ ڕوو لـەوە بكـەین كـە كوشتن واتە بە ئە نجام دانی لە ناو بردنی كەسێك كە وە ك تۆ ما فی ژیـان و گوزەران وراو بۆچوون و دەربڕینی هەیە كـە چـی تـۆرێگری لـە هـەموو ئـەم بنەمایە دەكەیت ، تا دەگاتە ئاستی ئەوەی ڕێگـە نـادەی كـە بـژیت، لەگـەڵ هەموو ئەو ئاستەمەو تەنگەژەو خۆشیەی كەلەم بوونە دەی بینیێ.

لەهەمان كات تۆ هیچ ما فێكت نیە، بۆ لـەناو بردنـی كـە سـێك وەك خـۆت، بەڵكو تۆمافی كوشتنی گیانی خۆشت نیە،چونكە تۆ كەسێكی بێ لق و پۆپ نیـت گەر تۆبڕیاری نەژیانی خۆت دەدەیت دەبـێ كەسـێك لەجێگـەی خۆتدروسـت بكەی گەردەتوانی، چونكە تۆخۆتت دروست نەكردوە دروست كراوی، یـاخوت هەرهیچ نەبێ بتوانی كەسێك لە پاش خۆت دابین بكەی بۆ منداڵـە كانـت یـان بۆدایك و باوكت و خوشك و براكانت ئەوانیش مـافی ژیانیـان بەسـەر تـۆوە هەیە یاخود بە شیان بە تۆوە هەیە..

هەر بۆیەگەر سەیری گشت ئاینەكانی جیهان بكەین چ ئاینی دەستكردی مرۆڤ، كەڕەنگە ئاینێكی ئاسایی بێت یاخودئاینی ئاسمانی ، هەموو ئاینە كـان بەگشـتی ڕێگری كوشتن دەكەن بە تایبەت ئاینی پیرۆزی ئیسلام " دەبینین ڕێگـر یـەكی

زۆری هەیە لەسەر کوشتن بە پێچەوانەوە هەر ئا یـەتێك کـەخوای گـەورە بـۆ بەندە کانی دای بە زاندوە، بۆ بە فریاهاتنی مرۆڤایەتیە بە گشـتی تـا دەگاتـە ماف دان بە ئا ژەڵ و دارو بەرد..

کە پەیام بۆ موسا علیە سلام دابەزی لەکاتە فیرعەون و تاغوتەکان جگە لـەوەی خەلکیان کردبوو بە کۆیلـەو ئافرەتـەکان بەکـەنیزەو زولم وسـتەم و کوشـتن و خوێن ڕشـتن بـە بـێ هۆکـارو مافـدان تەشـەنەی کـرد بـوو لـەم ولاٌتـەو دەو روبەریشی، هەروەك خوای گەورە دەفەرموی ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنْجَاكُمْ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ وَفِي ذَلِكُمْ بَلَاءٌ مِنْ رَبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾ (١) واتـە: موسـا بەقەومەکەی گوت یادی بەخشینی خوا بکەنەوە کەدەربازی کـردن لـەفرعونوو دە ستوو پێوەندی کە کورە کانیان سەر دەبڕین و ئافرەتەکا نیان دە هێشتەوە بۆکۆیلایەتی ..

جگە لەستەم کردنی هێرشەکانی ئیپراتۆریەتی یۆنانی و هێرشی ( هیتیـە کـان) و بڵاوبوو نەوەی دەردوو تاعون لەناو میللـە تـان پێویسـتیان بـە( نجـات) دەرێـك هەبوو، ئەم پەیامە واتە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بووە مایـەی شـۆردنی دەروون و خاوێن کردنەوەی پیسی لاشەو، چەندین دەرمانی بۆ گەلە کـەی بەجێهێشـت و ئەم کاتەی پەیام بۆ محمد (ص) دا بەزی گەلی عەرەب بە تایبەتی و درا وسێیان

١- سورەتی ( ابراهیم ) ئایەتی ( ٦ )

و میللەتان بەگشتی، توشی کارەسات ببون، وەك کاول کاری و ڕوخانی بنەمای کۆمەلا یەتی و دەست خستنەخوێنی یەکتر وەتەنانەت زیندە بەچال کردنی مال و منداليان ،

لە هێرشەدەرەکیەکان لە ڕۆژهەلاتی فارس لـەخۆرئاوا قەوقەسـیەکان لـەباکور قەیسەری یۆنانی و ساسانی و ..... هتد .

ئەم پەیامە جگەلە دەرمان کردنی دەروونی و عەقلی، دەرمانی گیانیشی دەکرد ،گەرسەیری ( **طوب نبوي** ) بکەین چەندین ( أعجاز )ی علمیمان بەرچاودەکەوێ، ئەمانە هەموو بەڵگەن کەئاینی پیرۆزی ئیسلام پەیامی دەرباز کردنی میللە تانە ،لەکێشەو گرفت و تێچە قین ئێمە دەمانەوێ جگەلەم پێشەکیە، باس لەکوشتن بکەین، کە لەڕوانگەی ئیسلام لەم شەریعەتە پیرۆزە چەندە ڕێگری لەکوشتن و لەناوبردن کردووە، سەرەتا خوای گەورە ئاوا ڕێز لەمرۆ ڤایەتی دەگرێت هەروەك دەفەرموێ ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾(١) واتە: من جێنشینی خۆم لەسەر زەوی دادەنێم کەواتە ئێمەی ئادەمیزاد ،خوای گەورە بەجێ نشینی خۆی ئێمەی ناردۆتە سەر زەوی گەرئێمە دەستمان بچێتە خوێنی یەکتر واتە

---

١- سورەتی ( البقره ) ( ٣٠ )

دەستمان بردوە بۆ خوینی جیٚ نشینی خوای گەورە، ئینجا خوای گەورە باس لەوە ناکات کە ئیٚمە خواپەرستین یان لامان داوە ،گرنگ لەوە دایە ئیٚمە ڕیٚز لە مرۆڤایەتی بگرین وەك مرۆڤ .!

خـوای گـەورە دەفـەرمویٚ ﴿... وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ .... ﴾[1] واتـە: ئیٚمـە ڕیٚزمان لەوەچەی ئادەم گرتوە ئینجا پیٚغەمبەر درودی خوای لەسەر دەفەرمویٚت ﴿ الذهاب الدنيا كلها اهون من سفك دم امري مسلمٍ﴾ .[2] واتـە : لـە نیٚـو چوونی هەموو جیهان چاکترەلە ڕژانی خویٚنی خۆی بەدەستەوە دەریٚك لیٚرەکـە پیٚغەمبـەر(ص) دەفـەرمویٚت (مسـلم) واتـە: خـۆ بەدەسـتەوە دەریٚـك نـەوەك ئیماندارێك " گرنگ نیە چەندە ئیمانی هەیە بەخودا ( گرنگ ئەوە یە (مسلم)ە واتە: کەسیٚکی بیٚ کیٚشەیە

---

١- سورةتی ( الاسراْ ) ئايةتی (٧٠ )

٢- اخرجة الترمذي ١٣٩٠ ونسائى ٢٩٩٧ من حد يث عبدالله بن عمر و

( تسلم ) بووه یا خۆی به دەستەوه داوه بۆ یاسای شەرعی خودا بۆنمونه (مسلم) کێیه پێغەمبه ر(ص ) ده فه رموێت ( المسلم من سلم المسلمون من لسانه ویده ) [1] .: واته:موسلمان ئەو کەسەیەکه خه ڵك لەزمان و دەستی

پارێزراوبن نەیگوتووه ئیمان دار. یاخود خودای گەوره دەفەرمویٚ به پێغەمبەر درودی خوای لەسەر ﴿ قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ ﴾ [2] واته : خێوەت نشینەکان وتیان بڕوامان هێناوه پێیان بلیٚ ئێوەبڕواناهێنن بەلاٚم خۆمان بەدەستەوه داوه واته:( ئیمان ) پەیوەندی به ( ئیسلام ) ەوه نیەبەڵکو هەموو ئیمان دارێك ئیسلامه بەلام مەرج نیه هەموو ئیسلامێك ئیمانداربێت. لێره بۆمان ڕوون دەبێتەوه ڕێزی مرۆڤایەتی بەگشتی گیراوه لەئاین بەبیٚ جیا وازی باوەڕ،گرنگ لەوەیه (مسلم ) بیٚ، بەبیٚ کێشەو ئاشتەوابیٚ و لەدژت لەجەنگدا نەبێت، و لەبارەی بڕواداران کەرێز یان لەپێش تره خوای گەوره ده فەرمووی

---

١- بخاری ﴿٦١١٩﴾

٢- سورەتی( الحجرات ) الایه ( ١٤ )

﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا ﴾[١]

واتە : هەرکەسێک بڕواداریێک بەئەنقەست بکوژێ :-

جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا.. دە بێ هەتا هەتایە لەدۆ زەخ بسوتێ:-

وَغَضِبَ اللَّهُ . تورە یی خودای ڕوو بەڕوو دەبێتەوە .

وَلَعَنَهُ — بەبەر نەفرەتی خوای گەورە دەکەوێ .

وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا :- وەسزایەکی گەورەی بۆدابین دەکرێ، وە پێغەمبەر درودی حوای لەسەر دەفەرموێ « زوال دنیا اهون عنداللّه من قتل ر جل مومن »[٢] واتە:- تێک دانی هەموودونیا بێ نرخترە لەلای خودای گەورەلەکوشتنی بڕواداریێک .

یاخود لەشو ێنێکیتر پێغەمبەرمان ( درودی حوای لەسەر) دە فەرموێت :ڕوخانی کەعبەی پیرۆز ئەهوەنترە لەلای خوای گەورە لەکوشتنی بڕواداریێک.

خوای گەورە بەرامبەر مالی خۆی ڕازی بێت بەڵام خوێنی باوەڕ داریێک نە ڕێژرێت ئەی چۆن ئێمە لەسەر شتێکی بێ بایەخ دەبێ دەستمان بچێتە خوێنی کە سێک.؟

---

١- سورەتی ( نیساء) ئایەتی ( ٩٣ )

٢- لحديث صححه الألباني في صحيح الجامع ٩٢٠٨

پێغەمبەر درودی خوای لەسەر لە حجی مال ئاوایی دە فەر موێت : بە شێوە یـە کی گشتی ( یا ایها النا س) ئە ی خە لکینە نا فە رموێ ئە ی بـاوەڕ دارینـە بـە لکو بۆ هە موو خە لـک ( یـا ایهـا النـاس ) ،(( إن دماءكم وأموالكم حرام عليكم كحرمـة يـومكم هـذا فى شـهركم هـذا فى بلـدكم هـذا، ألا كـل شـيء مـن أمـر الجاهلية تحـت قـدمي موضوع، ودماء الجاهليـة موضـوعة، وإن أول دم أضع من دمائنا دم ابن ربيعة بن الحارث كان مسترضعاً فى بنى سعد فقتلته هـذيل، وربا الجاهلية موضوع وأول ربـا أضع ربانا ربـا عباس بـن عبـد المطلـب فإنـه موضـوع كلـه، فـاتقوا الله فى النسـاء فـإنكم أخـذتموهن بأمـان الله، واسـتحللتم فـروجهن بكلمـة الله، ولكـم عليهن أن لا يـوطئن فرشـكم أحـداً تكرهونـه فـإن فعلـن ذلـك فاضـربوهن ضـرباً غـير مـبرح، ولهـن عليكم رزقهـن وكسـوتهن بـالمعروف، وقـد تركـت فيكم ما لن تضلوا بعده إن اعتصمتم به: كتاب الله، وأنتم تسألون عنى فما أنتم قائلون؟ «قـالوا: "نشـهد أنـك قـد بلغـت وأديـت ونصحـت"، فقال بإصبعه السبابة يرفعها إلى السماء وينكتها إلى الناس: اللهم أشهد، اللهم أشهد -ثلاث مرات [(١)]

---

١- (رواه مسلم ﴿١٢١٨﴾ وأبو داود ﴿١٩٠٥﴾ وابن ماجه ﴿٣٠٧٤﴾ والدارمي ﴿١٨٥٠﴾))

واته:- ئەى خەڵكينه خوێن وماڵتان لەسەر يـه كـتر قەدەغەيـه وەك ئـەم ڕۆژه له ..............)

ئايه پێم ڕاگه ياندن خوايه تۆ شاهێدبه  هەموو شتێكى ( مسلم  له سه ر مسـلم ) قه ده غەيەخوێن و سامان و ئابڕو ..

لێره وشەى ( مسلم ) تەنها بريتى نيه لەمو سلمان كه ئيمانى بەخوا هەبێت بەڵكو بريتيه لەو كەسا نەى كەوا  تەسليمى ياساى  ئيسلامين واتا بەگشتى هەموو مرۆڤايەتى، لەم كۆمەله فەرمو دەيه دەبينين گەلێك مافى تێدايه، لەپێشى هەموومافەكانى  مافى ( ژيانه ) كەپێش مال و سامان وئابڕو دێت ..

خواى گەوره  دەفەرموويێت: ﴿وَلَا تَقْتُلوا النَّفسَ التِي حَرَّمَ اللَّهُ إلَا بِالْحَقِّ ﴾ (١)

واته : كه سێك مەكوژن كه خواى گەوره قەدە غەى  كوشتنى كردوه  بەبێ تـا وان ..ئاينى پيرۆزى ئيسلام جگه لەدانانى ماف بەمرۆڤى له دايك بوو" ڕيگه نـا دات ئەم كۆر پەلەيەى كەله سەرەتاى هەلگرتنه لەلايەن دايكەوه لەنێو ببرێـت ..خواى گەوره ده فه رمويـێت ﴿وَلَـا تَقْتُلـوا أَوْلَـادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَـاقٍ نَحْنُ نَـرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطئًا كَبِيرًا ﴾ (٢)

---

١- سورةتى (الاسراْ) (٣٣ )

٢- سورةتى (الاسراْ  ) ئايـةتى (٣١ )

واته: لەبەرترس و هـەژاری کـۆر پـەکانتان مـەکوژن ئێمـه بـژێویان دەدەیـن بەراستی کوشتنیان هەلە یەکی گەورە یە..

یەکەم کوشتن کەرویدا لەنێو مرۆڤایەتی یەکێك لەکورەکانی ئادەم بـوو (علیـه سلام) کەهەلسابە کوشتنی برایەکی خۆی لەبەر گەورەیی ئـەم تاوانەپێغەمبـەر (ص) دەفەرموێ ( لا تقتل نفس ظلما إلا كان على ابن آدم الأول كفل من دمها لأنه كان أول من سن القتل )[(١)]

واته: هەر کەسێك کە سێك بکوژێت کورەکەی ئـادەم بەشـێکی ئـەم تاوانـه هەڵدەگری چونکە ئەو بوو بۆیە کەمجار کوشتنی داهێنا.

ئەم توندییەی کەشەریعەتی خواهەیەتی بۆ ما فی ژیان بەڵگە ی ڕێزی مـرۆ ڤـا یەتیە لەرووی ئاینەوە ..

هەر بۆ یە( ابن عباس دە فە رموێت (ر.خ) {لا تَوبَةَ لقاتلِ المُؤْمِن عمْدًا }

واته:- هەر گیز تۆ بە لەبکوژی ئەنقەست وەرنا گیرێت

---

١- البخاري ٦٨٦٧ومسلم ١٦٧٧

چونکه ئایەتی ﴿وَلَا تَقْتُلُوا النَّفسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ (( الى قوله )) إِلَّا مَن تَابَ﴾[١] واتا: تا توبه دەکات بێش ئایەتی ﴿وَمَن يَقتُل مُؤمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا﴾[٢] واتا : لەدۆزخ دادەبی تا هەتایه به رنەفرینی خودا ده کەوێ و به توند ترین شیوه ئازار دەدرێت " دابه زی به شه ش مانگ کەواته فەرمودەی ابن عباس لە جیگای خویەتی . کوشتنیش ئەوەنیەکه تۆ بەکەرستەیەک هەستی بەکوشتنی کەسێک بەڵکو بەهەلوێست یان بەقسە ئاما ژه یەک لەسەرت تۆماردەکرێت ..

گەرتۆ بەدڵ پێت خۆشبێ که کەسێ کو ژراوه یان ده کوژرێت به قەد ئەم نیەته تاوانبار دەبێت وەشەریک دەبیت لەگەڵ بکوژ..

پێغەمبەر درودی خوای لەسەر دەفەرموێ « لو ان أهل السماء وأهل الأرض اشتركوا فى دم مؤمن لأكبهم الله فى النار»[٣]

واتە: گەر خەلکی ئاسمان و زەوی کۆببنەوه لەسەر کوشتنی برِواداریێک خوایگەوره هەمووی راپێچی ئاگر دەکات بەرامبەر کوشتنی کەسێک

---

١–سورة الاسراء –٣٣

٢– النساء: ٩٣

٣–[رواه الترمذي ١٣٩٨، وصححه الألباني}

بەڵکو پێغەمبەر (ص) دەفە رمویێت { من أعان على قتل مسلم بشطر كلمة لقي الله يوم القيامة مكتوب على جبهته : آيس من رحمة الله}[1]

واته: هەرکه سێک بەنیو وشەش لەگەڵ کوشتنی (مسلم) یک بێت لەنێو چەوانی دەنوسرێت لە ڕۆژی قیامەت بێ بەش بوو لەبەزە یی خودای میهرەبان..

ئینجا پێگەی مرۆڤایەتی پیرۆزه مرۆڤ بەهیچ بیانوو یەك نا کوژرێت بڕوادارو بێ بڕوا له زۆرینەی مافەزە مینیەکان یەکسانن ..

گەر باسی پلەی باوەڕی مرۆڤەکان بکەین خوای گەورە دەفەرموویێت ﴿ هُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَائِفَ فِي الْأَرْضِ فَمَنْ كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ وَلَا يَزِيدُ الْكَافِرِينَ كُفْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا وَلَا يَزِيدُ الْكَافِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا﴾[1] واته: ئەم زاتەیە کەئێوەی کردەجێ نشین لەسەر زەوی ئەوەی بێ باوەڕ بێت بێ باوەڕ یەکەی لەسەری دەبێ واته لەسەر زەوی ئادەمیزاد .

مرۆڤایەتی جێ نشینن بابەتی (کفر و ئیمان ) دەگەرێتەوە قیامەت..

---

١- بيهقي في شعب الايمان ٥٣٦٤

٢- سورةتى ( فاطر) ئايةتى (٣٩)

مرۆڤ لەما فی ژیان لەسەرزەمین ولەناو ژیـان یەکسـانن چـونکە خـوای گـەورە دەفـەرموێت ﴿ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُر ﴾ [1] واتـە: ئـەوەی دە یەوێت بابڕوابهێنیت،ئەوەی دەیەوێ بیٚ باورەبیٚ بابیٚ بڕوا بێت.کە ئە مە ژیانە مرۆڤ تێدا جیٚ نشین کـراوە بـۆ تـا قیکردنـەوە نـە وەك بـۆ لێپێچـینەوە وە لێپێچینەوە بۆ قیامەتە خوای گەورە دە فەرموویت﴿لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ [2] کەس مافی کوشتنی کەسیتری نیەتەنانەت بەبیا نووی ئاینیشـەوە چـونکە بـیٚ باوەڕیش ما فی ژیانی هەیە.. (کا فر مسلم ) یان ( بیٚ باوەڕی تە سلیم بووا کە باوەڕ و ئیسلام جیان بەلاّم ما فیان بەسەر شە ریعە تی ئیسلام هەیە .. زۆر کەس هەیە کافرە بەڵام ( مسلم )ە تە سلیم بـووە بەشـەریعەتی ئیسـلام وەکو ئەوانە لە دوای فتحی مەکە لەناو مەکە لەگەل ئیماندااران دەژیان کـەس بۆی نەبوو کەس بکوژیٚ وە هەزاران نمونە ی تریش.بۆ نموونە: بخـاری فـەر موودە یە ك لە عبداللّە ی کوری عە مری عاصەوە دەگێرێتەوە کە پێغە مبە ر درودی خوای لەسەر دەفە رموویت {من قتل معاهدا لم يرح رائحة الجنه، وإن ريحها ليوجد من مسيره أربعين عاما} [3]

---

١- سورة ( الكهف) (٢٩)

٢- البقرة (٢٥٦)

٣- لبخاري : الجزية (٣١٦٦) ، والنسائي : القسامة (٤٧٥٠) ، وابن ماجه : الديات (٢٦٨٦) ، وأحمد ١٨٦/٢.

واتە: هەر کە سێک ( معاهد ) ێک بکوژێ بۆنی بە هەشت ناکات هەرچەند لەماوەی چل سالە رێ دووری بۆنی بەهەشت دەکرێت ..

لێرە وشەی ( معا هد ) بەو کافرە دەگوترێ کەتە سلیمی یاسای ئیسلامە ببونە بەڵام لەسەر بێ باوەڕی و کوفری خۆی بەردەوامە ..

یا خود جزیە دەداو بەڵام لەسەر ئاینی کۆنی خۆی کەهەر چەندە کوفریش بێت ماوەتەوە ..

## خۆ كوشتن لە شەریعەتی خوداو

## لە ژێر یاسای ئیسلام

لەشــەریعەتی خوایگــەورە، لەبنــەما یاســاكانی ئــاینی ئیسـلام خــۆ كوشــتن جگەلەوەی كوشتنی نە فسێكەو هەموو ئەم دەقانەی پێشتر باسمانكرد لەسـەری چەسـپاو دەبێـت چـونكە كوشـتن هەركوشـتنە گـەر نەفسـی خۆشـت بـێ ، باسمانكرد لەسەرە تا، مرۆڤ خاوەنی لاشەی خۆی نیە بەڵكو ئـەویش سـپاردەی خوای گەورە یە لەسەرت، وەجگەلە خۆت چەندكە سـێك مـافی بەسـەر گیـانی تۆوە هەیە، وەك ماڵ و منداڵ یان دایك و باوك و خوشك وبرا..

تەنانەت مافی ئاین و كۆمەڵگەی موسلمانیشی دەكەوێتە سەر، چونكە تۆ تاكێكی موسڵمانی نابێ ببیە هۆی كەمبوونەوەی موسلمانێك، یا خود بەم كردارە ببیـە هۆی داهێنا نی بیری خۆ لەناو بردن لەكۆ مەڵگای ئەمڕۆ..

كەئەویش رەنگە ،وەك نەخۆشی بگوازرێتەوە یان ببێتە چاو لێكەری وە خۆ كوشتن، تاوانێكە لەروانگە ی ئاینی ئیسلام و زانست گەرایەكان، لە تاوانی كوشتنی خەلك گەورە ترە چونكە:

١) تۆ بەم خۆ كوشتنە نارازی دەر دەبڕی بەرامبەر ( قضا وقدرا) ی خوداو بەرامبەر ئەو بەشەی كە خوای گەورە لەسە ری پێویست كردووی .

٢ ) ڕەنگە مرۆڤ هەندێ جار توشی کارە ساتێك بێـت، یان توشی خەمۆ کیەك بێت، کەبەئارام گرتنێکی کەم (صبر) کێشەکەت چارەسەر دە بێـت، بەڵام تۆ بەرگەی ئەم کێشە یەنا گریت و ( صبر) ناکری کەفرمانی یەزدانیشە ( صبر ).

خوای گەورە دەفەرموویێت ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ (١)

واتە /ئەی بڕوادارینە داوالە خودا بکەن بە نوێژ و ئارام گرتن تان خوای گـەورە لەگەڵ ئارام گرانە،گەر ئێمە ئارام نەگرین لەسـەر کێشـەکان واتـە لەفـەرمانی خوای گەورە دەرچووین ،ئەمەش خۆی لە خۆی دا سەرپێچیە لە فەرمانی خودا .

٣)خوای گەورە دەفەرموویێت ﴿وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ ( ١ )

واتە :خۆتان مەکوژن خوای گەورە بە بەزەیی یە لەگەڵتان ، ئەم ئایەتە دەقێکی زۆر ئاشکرایەبە رامبەربە قەدەغەی خۆکوشتن، ( ولا تقتلوا ) دیسان( فعل امر)ە ، کە تۆ لەم فەرمانەدەر چوویت سەرپێچی خوای گەورەت کردووە .

دەمەوێت ئەوە بلێم کە سەرپێچی و سزای خوایگەورە لـە دووخـاڵ خـۆی دە بینتەوە ، کاتێك مرۆڤ تاوانبارە کەلەم دوو خالە خۆی ببینیٚ،

---

١- (البقرة) (١٥٣)

٢-النساء (٢٩)

أ- **نە** کردنی کارێک کە خوای گەورە بۆی داناوی بەکردنی .

ب- کردنی کارێک کەخوای گەورە لیٚ ی قەدەغە کردووی .

جا لێرە خوای گەورە دەفەرمووێ ( لا تقتلو ، استعینو ...... هتد .

کە فەرمانێکەبۆ نەکردن..

وەلە بارەی خۆکوژیەوە پیغەمبەر سەلامی خوای لەسەر دەفەرمویٚ،

( مَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ يَتَرَدَّى خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا ، وَمَنْ تَحَسَّى سُمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَسُمُّهُ فِي يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا ، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ ثُمَّ انْقَطَعَ عَلَيَّ شَيْءٌ خَالِدٌ ، يَقُولُ : كَانَتْ حَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ يَجَأُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا )[١] واتە:

هەر کەسێک لە شاخێکەوە خۆی بخاتە خوارەوە خۆی بکوژێت ، ئەکەوێتە خوارە وە بۆناو ئاگری دۆزەخ بۆ هەتا هەتاییٚ تیٚی دا دەمێنێتەوە. وەهەر کەسیٚ خویٚ ژەهر خواردوو بکات ژەهرەکەی بە دەستەوە ئەبێت لەئاگری دۆزەخ هەرلیٚ ی دەخواتەوە بۆ هەتا هەتایە، بەم شێوەیە ئەمێنێتەوە ،وەهەر کەسێک بەپارچە ئاسنێک خۆی بکوژێت ،پارچە ئاسنەکەی بەدەستەوە دەگرێت لەئاگری دۆزەخ و دەیدات لەخۆی بۆ هەتا هەتایە لە دۆزخ .. -

---

١- البخاری ٥٧٧٨ ومسلم ١٠٩

وه بوخاری له ئەبو هورەیرە وە ئەگێرێتەوە ،کەپێغەمبەر درودی خـوای لەسـەر فەرموویەتی (( الَّذِي يَطعَنُ نَفْسَهُ إِنَّمَا يَطْعَنُهَا فِي النَّارِ ، وَالَّذِي يَتَقَحَّمُ فِيهَا يَتَقَحَّمُ فِي النَّارِ ، وَالَّذِي يَخْنُقُ نَفْسَهُ يَخْنُقُهَا فِي النَّار ))[1]

واته: هەرکەس خۆی بخنکێنی لەئاگریشدا هەر خۆی دەخنکێنی، وەئەوەی تیغ بکات بەخۆی داو خۆی بکوژێت ، لەئا گریشدا بەردەوام تیغ لەخۆی ئەدا.. وه هەرکەسێ خۆی هەڵداتە خوارەوە هەتا بمرێ ، بەردەوام لەئاگریش خـۆی هەڵدە داتە خوارەوە، بەکۆی دەقـەکان بۆمـان بـە دەردەکـەوێت خـۆ کـوژی مانەوەیە لەئاگر تاهەتایی.کە واتە گەر مرۆڤ مافی کوشتنی خۆی نـەبێت ،ئایـە بە چ شێوە یەك مافی کوشتنی کەسی دیکەی هەیە

وه له دەقێکیتر پێغەمبەر درودی خوای لەسـەر دەفـەرموێت (كَانَ فيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ بِهِ جُرْحٌ فَجَزِعَ، فَأَخَذَ سِكِّينًا فَحَزَّ بِها يَدَهُ فَما رَقَأَ الدَّمُ حَتّى مَاتَ، قَالَ اللّهُ تَعالَى بادَرَنِي عَبْدي بِنَفْسِهِ حَرَّمْتُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ)[2]

واته: له نەوەکانی بێش ئێوە پیاوێك برینێکی پێوە بـوو ، نارەحـەت بـوو خـۆی نەگرت چەقویەکی هەڵگرت دەستی خۆی پـێ بـڕی، خـوێنی نـەوە سـتایەوە هەتا کو مرد..خوای گەورە فەرموی بەندەکەم پەڵـەی کـرد لـەگیانی خـۆی :منیش بەهەشتم لەسەرحەرامکرد.

---

١- البخاری ١٣٦٥

٢- بخاری لة جوندوبی کوری عبدالله هێناو یَتی ١٣٦٤ مسلم ١١٣

یا دەفەرمووێ ( مَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْءٍ فى الدُّنْيا عُذِّبَ بِهِ يَوْمَ الْقِيامَةِ) (1)

واتە: هەرکەسێك خۆی بکوژێ بەشتێ رۆژی قیامەت بەوە سزا دەدرێ.

---

١- البخاری ٦٦٥٢ مسلم ١١٠

## تیرۆر  یا  پەنهان کوژی

ئاینی پیرۆزی  ئیسلام چونکە شەریعەتی  دەربازکەرە نەوەک شەریعەتێک  بۆ لەناو بردن بەڵکو بۆئەوە هاتوە ژیانی مرۆڤایەتی ڕۆشنکاتەوە خەلک بژینێت نەوەک بیکوژێت، هەرگیز بیری لەپەنهان کوژی نەکردۆتەوە، نمونە خەڵکی ( تائف ) بەرد بارانی پەیام بەریان کرد سەلامی خوای لەسەر،  هێشتاش پێغەمبەر درودی خوای لەسەر  دوعای بۆ دەکردن کەلە سیرە ( ابن هیشام ) هاتوە ..

خوای گەورە  جبرائیلی نارد کە هەواڵی ئەوەی پێ بدەن گەر ویستی لەسەر بێت ،خوای گەورە لەبەینی ئەم دوشاخە لە ناویان دەبات ، بەلاَم  محمد درودی خوای لەسەر  هیوای بە دوا رۆژیان هەبوو..

گە رسەیری  ژیان نامەی پێغە مبەران  بەتایبەتی پێغەمبەر محمد درودی خوای لەسەر  بکەن دەبینین چەند جار هەوڵی تیرۆر کردنیان داوە، هەر لەسەرە تا قورەیش بەئامادەی ئیبلیس و گەورە پیاوانی قورەیش کۆبونەوە بۆئەوەی بچنە سەر مالی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر ، کۆمەلێک گەنجی قورەیشی تیرۆری بکەن،  بەلاَم خوای گەورە لەم تیرۆرە دەربازی کرد، کەئەم شەوە لە ( الدار الندوە ) کۆببو نەوە بۆراوێژکردن  لەبارەی تیرۆر کردنی محمد درودی

خوای لەسەر ،سە رانی کوفر بوون کە ئازاری  بـیلال و یاسـر و سـومەییە یـان دەدا تا شەهید یان کردن.

تەنها لە بەر ئەوەی دەیگوت ئێمە خوای بە تاك و تە نها دە پە رستین ..

هەر سەرانی کوفر بوون کەشەریعەتی خواو ئاینی ئیسلام ،بانگە شەی برایـەتی بۆ دەکردن، ئەوانیش خەریکی پیلان گێڕان بوون بۆ تیرۆرکردنی محمد درودی خوای لەسەر، بە ژەهردەر خواردان یان لەشاخ بەردانـەوە یـا خـۆ مـەلاس دان لەرێگا ..

زۆرینەی خەلیفەکانی دوای پێغەمبەر درودی خوای لەسەر تیرۆرکران لەناو نوێژ {  عمرکوری خطاب ، امامی  علی، .........هتد}

تادەگاتە خەلیفە عەباسیەکانیش، ئیسلام رێگەبە تیرۆر و پەنهان کـوژی نـادات بەڵکو هەر موسلمانە تیرۆرو پەنهان کوژی دەکرێت..

ئەوکاتەی ئازاری پێغەمبەر درودی خوای لەسەر  دە دراو ریخەلۆکی پیسی ئاژەڵیان لەسەر سەرخاڵی دەکردەوە،  کورانی  عبـد المطلیب  دەخرانە ئابلۆقەی سەختی رۆژگار،

لە هەمان کات پێغەمبە ر درودی خوای لەسەر و ئیسلام، خاوەنی چەندین کە ڵە پیاوی وەك ( علی و حمزە و سعد و عما رو عسمان و ابو بکر و .......هتد  ) بوو، رەزای خوایان لە سەر،ئایە نەیان دەتوانی کە ( ابو جهل ) پە نهان کوژ بکەن ؟ خۆڵەم  ساتە وە  ختە دا  ( ابو جهل ) هیچ پاسە وانێکی نەبوو.

سەرەرای ئە وەی  گەورە ترین دوژمنی  خوا و ئاینی ئسلام بوو ، بە تەنها لە نێو کۆلانە کانی مەکەدە سورایە وە، شێرێکی وەک ( حمزە و علی )  نەیان دە توانی بە دۆزەخی شادبکەن .

بێگومان بەلیٰ بەلاٚم ئیسلام بۆ گۆرینی روخسارەکان  نەهاتوە بۆ گۆرینی دڵەکان هاتووە ئیسلام ((نەخۆش ناکوژێت بەڵکو میکرۆب دەکوژێت ..))

ئیسلام چاوی لەوەیە کەسێک زیاتر بە بەهەشت شاد بکات . ئەگەر( نا کوشتن و برِین ) ئاسانترە لە ( گۆڕان و گۆڕین ..)

(خالیدی کوری وەلید ) ئەو کەسەبوو کە گەورە ترین زیانی بە موسلمانان گەیاند  لەشەڕی ( ئوحد )  بەلاٚم هەردەم جیٰ ی ئومێدی ئەوە بوو رۆژێک لەدەرگای ئیسلام  بدات ، تا ئەو کاتەی لەبەر بڕوای زۆر و سودی بۆئیسلام نازناوی شمشێری هەڵکێشراوی خودای پیٰ بەخشرا، هەموو ئەم خالانەی کەباسم کرد بەڵگەی مافی ژیانە،کە ئیسلام بەمرۆڤا یەتی داوە  چ بروادار یان بیٰ باوەڕ ،  تەنانەت ئیسلام رێزی لە دارو بەردیش گرتووە ..

لەبەرەی جەنگیش پێغەمبە ر درودی خوای لەسەر دەی فەرموو،

١ ) ئافرەت  مەکوژن  لەهەمان کات وەک پیاوەکان بۆ کوشتنی  ئیمانداران هاتبوون .

٢ ) مندالەکان مەکوژن.

٣ ) پیرو تەمەندارەکان مەکوژن.

٤ ) بیّ چەك  لەجەنگ دا ناكوژریّت.

٥ ) دیل نا كوژریّت .

٦ )دار و درەخت مەبرن.

٧ ) ئاو ی كانیاوەكان  پیس مەكەن.

٨ ) كەسیّك لەهەلویّستی خۆی پاشگەز بۆوە مەیكوژن.

(مسلم وبخاری ) فەرموودەیەك دەگیّرنەوە كە كەسیّك زۆر بەتوندی روو بە رووی موسلمانیّك دەبیّتەوە  تاكو بیكوژیّت ئەم كەسە كەسیّكی بیّ باوەر بو ترسی شمشیّری موسلمانەكە دەلیّ ( اشهد ان لا إله إ نی اللّه واشهد  ان محمد رسو الله )[(١)] بەلّام موسلمانە كەدەی كوژیّت.. ئەم هەوالّە دەگاتە پیّغەمبە درودی خوای لەسەر ، ئەویش سەركۆنەی موسلمانە كە دەكات و دەفەرموویّت ( قتلته نفسا بعد قال لااله الی الله ............)

واتە: كەسیّكت  كوشت پاش ئەوەی گوتی ( لا إ لە إلاالله ) گوتی ئەی پیّغەمبەری خوا لەبەر خوا نە یگوت بەلّكو لەترسی شمشیّرەكە وای گوت هەر چەند ئیمەش باش دەزانین كەوایە، بەلّام پیّغەمبەر فەرمووی درودی خوای لەسەر ( هل شققته قلبه ) ئایە دلیت دوولەت كردبوو كە بزانی وایە یان نا، ئەم هاوەلّە ی پیّغەمبەر درودی خوای لەسەر دە فەرموویّ پیّغە مبەر(ص) هە ردە هات و دەچوو دەیگوت باشە لە قیامەت چی ( لە (لا إ لە إ لە الله ) دە كە ی

١- صحيح البخاري (٤/١٥٥٥) وصحيح مسلم (صحيح مسلم (١/٩٧)

راوى دەلىٚ هێندە واى گووت هیوام دەخواسـت پـێش ئـە مـرۆژە موسـڵمان نەبام..

ئینجا لێرە بۆمان بەدەر دەکەوێت کە ئیسلام چەندە لە بیانووە بۆ ئـەوەی کـە سێك بکاتە ئسلام ، یا کە سێك نە کوژێت بە هیچ بیا نوویە ك چونکە « مرۆڤ بۆ ژیان دروست کراوە نە ك ژیان بۆ مرۆڤ...!!!

## سزای  بکوژ

## لە شەریعەتی خودا ( ئسلام )

لە شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام ، بەرامبەر بەبکوژ دوو بەش سزا هەیە سزایەك لەدنیا کە تۆ ڵەی لێوەر دەگرێتەوە سزایەکیش  لەقیامەت بـۆی هەڵـدەگیرێت دەرحەق بەکەسی بکوژ، کە تووشی رژانی خوێنێك دەبێت ..

وەچۆنیەتی وەرگرتنـەوەی تۆڵـە دەدرێتـە دەسـت،  دادوەری ئیسـلام، لـەژێر سێبەری چەند ئایـەت و فەرموودەیـەك تۆڵـەی لێ وەردەگرێتـەوە ، جیـاوازی دەکرێت لەئاست ئەم کەسە ،بە ئەنقەست بێ یان بـێ تـاوان کـە کـوژراوە ، یالەکاتی بەرگری یان بە هەڵە ......هتد

بۆ روونکردنەوەی ئەم باسە پێویستە بەچەند خالێك  دابچین.

❖سزای ( بکوژ )

١.  تۆڵە کردنەوە لە دونیا .

٢. تۆڵە کردنەوەی قیامەت.

أ- تۆڵەسەندنەوە  لەدونیا بەگوێرەی کارەکە

ب-    کوشتنی بەهەڵە .

ت-    کوشتنی  ( شوبە عمدی ) نیمچە ئەنقە ست

پ-    کوشتنی بەئەنقەست  ( پیلان بۆ  کێشراوە )

❖کوشتنی کە سێک بە پیلان پە یوەستە بەم چەند خاڵە

١. پا رێزگاری لەگیان .

٢. تۆڵە سەندنەوە لەسەر گیان.

٣. کوشتنی کە سێک لەسەر ئابڕوو.

٤. لە نێو بردنی منداڵ .

٥. بەر گری کردن لە خاك .

یەکەم : سزای دوا رۆژ ( قیامەت ) بۆ کەسی بکو ژ لەشەریعە تی ئیسلام

ئێمە لە پێشدەست باسی گرنگی ژیان بۆ مرۆ ڤمان کرد لە روانگەی شەریعەتی ئیسلام ،کەخوای گەورە چەندە ما فی بەمرۆ ڤ داوە بژیت، وە چە ندە ریگرە لەکوشتنی کەسێک ، بە هەر بیا نوویەك، بە رامبەر ئەوە خوای گەورە کۆمەڵێك سزای بۆ بکوژ لەقیامەت دابین کردوە ...

١) خوای گەورە دەفەرموویت ﴿ وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا﴾ [(١)] واتە: ئەوەی بروا دارێك بکوژێت بێ تاوان تا هەتایە لە دۆزەخ دا دەبێت.

٢) لە هەمان سورەت دەفەرموویت ( وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ ) واتە خوای گەورە تورە یی خۆی دەخاتە سەری ..

---

١- النساء (٩٣)

٣ ) له پاشان دەفەرمووێ ( ولعنه ) واته دەكەوێته بەر نەفرینی خودا

٤ ) له پاشان دەفەرمووێ ( وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا ) واته سزایەكی گەورەی بۆ ئامادە دەكرێت.

٥ ) ترمزی فەرموودەیەك له پێغەمبەرەوە ( سەلاموسەلاتی خوای لەسەر) دەگێرێتەوە دەفەرموی « لو أن أهل السماء وأهل الأرض اشتركوا فی دم مؤمن لأكبهم الله فی النار » [١] واتا گەر هەموو دونیا دەستیان هەبێت لەكوشتنی كەسێك هەموو یان دەخاتە نێو دۆزە خەوە، تێبینی: دەقی ئەم فەرمودە یەمان پێشتر هێناوە .

٦ ) بەیهەقی بەفەرموودەی ژمارە ( ٥٣٦٤ ) هێناو یەتی كە له رۆژی دوایی له نێو و چەوانی بكوژ دەنوسرێ ( ایس می رحمه الله ) بێ بەری لەرەحمەتی خودا

٧ ) له فەرموودەیەكی ( البخاری ) بە ژمارە ( ٣١٦٦ ) ها تووە بكوژ بۆنی بەهەشت ناكات ئەگەر چی چل ساڵە رێ دووردەر وات بۆنی بەهەشت..

٨ ) وە لەبارەی خۆكوژەوە چەندین فەرموو دەمان لەپێش دەست هێنایەوە كەخوای گەورە بەم كەرەستەیەی خۆی پێ كوشتوە لەناو دۆزەخ خۆی پێ دەكو ژێتەوە بە بەردە وام...

---

١–سنن الترمذي - ١٣٩٨ -

## دووەم : ( سزای بکوژ لەسەر دونیا ) لە شەریعە تی ئیسلام

گەر ئێمە باسی تۆڵەی ( سزای ) زەمینی بکەین بۆ کەسی بکوژ، باشتروایە چا وێك بەمێژووی پێش ئیسلام دابهێنینەوە ، کەوا بەرامبەر بە بکوژ پەیڕەوی چ یاسایەکی کۆمەلایەتی دەکرد، لەبەر بچوکی ئەم کۆ نوسراوەی بەردەستت نەبوایە رەنگە باسی یاسای هەموو جیهانم بکرد با بەکۆن و نویٚ وە بەرامبەر بەکەسی بکوژ ، یاسای تۆڵەسەندن دانراوە لەناو عەرەب دا لەسەر بناغەی کەتیرەیەك هەمووی بەلێپرسراو دادەنرێت لەم تاوانە، کەیەکیٚ لەئەندامە کانی کردویەتی ، مەگەر ئەم تیرە رای بگەی نێت لەناوتیرەکانی تردا کەدەست بەرداری ئەم ئەندامەیان بوونە و چیترپشگیری ناکات..

هەربۆیە خاوەن خوێن ( سزای تۆ ڵەکردنەوە ) ی لەهەموو تیرەکە دەکردوە ، زۆر جار ئەو داوایە دەبوە هۆی ئاگری شەڕێکی گەورە لە نێوان هەردوو هۆز ، هەندیٚ جار زیاتر پەرەی دەسەند ئەگەر کوژراوە کەخاوەن پلەو دەسەلأت یاخود گەورە بوایە لەناو هۆزەکەی ..

لەگەل ئەوەش دا هەندی ٚ لەهۆزەکان گوێیان نەدەدا بەم داوایەو بکوژەکە یان ئەپاراست هیچ گرنگی یەکیان بەکەس و کاری کوژراوەکە نەدەدا..

بەڵکو پێیان شوورەیی بوو کەبکوژ رادەستی بەرامبەر بکەن ، ئیتر بەم هۆ یەوە جەنگ لە نێوانیان بەرپادەبوو دەبوە هۆی لەناو چونی گیانی زۆر لـەبێ تاوانـان، کە ئەمەش نایەکسانیە لەمافی ژیانی تاك و کۆمەڵ جگە لە عەرەب لەنێو میلـە تانی تریش کۆمەڵیك یاسای قێزەون هـەبووە بەرامبـەر کـوژراوو بکـوژ، کـاتێ ئیسلام هات لەشەریعەتەکەی سنوری دانا بۆ ئەم یاسایە سـتەم کارانـە، وەرای گەیانـد و بـلاوی کـردەوە کـەتاوان بـار خـۆی بەتـەنها لێپرسـراوە بەرامبـەر تاوانەکەی وەتەنهاخۆی تۆڵەی لێدە سێنرێتەوە لەسـەر تاوانەکـە خـوای گـەورە دەفەرموێ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنْثَى بِالْأُنْثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ واتە :ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە تۆڵەتان لەسەرپێویست کراوە لـە کوژراوە کانتان لـەبری کەسـی ئـازاد ێـك لـەبری بەنـدە بەنـدە یـەك لەبەرامبەر مێی یی نەیەك مێی یی نەیەك .

---

١- سورة البقرة (١٧٨)

جا ئەگەر کەسێك خاوەن خوێنەکەی لێبوردەبوو بەماڵ رازی بوو یا هەر دوولاچاکە بکەن خاوەن خوێن داوای زۆر نەکات کەبۆیان هەڵنەسورێت وەبکوژیش بەباشەحەقەکەی بداتێ بەبێ دوا کەوتن ئەوە ئەم رازیبوونەو لێ بوردنە رازی بونێکی پڕسودەلەلایەن پەروەردگارتانەوەیە کەئەوە سزایەکی توندو تیژی بۆ هەیە وەبۆ ئێوە ئەی خاوەن هۆش و بیرەچاکە کان لەدانانی تۆڵەو جێ بەجێ کردندا ژیانی پڕ ئاسودەی هەیە بەئو مێدی ئەوەی لەخوا بترسن و گوێ رایەڵبن (گەرخاوەنی ستەم لێکراولێ ی نەبورین )

لەسەردەمی نەفامیدا لەنێوان دووتیرە لە نێوان تیرە کانی عەرەبی دا کێشەی خوێن هەبوایە یەکێك لە تیرەکان دەسەلاّتی لەتیرەکەی کە زیاتربوو سوێندیان خوارد لەجێگایی بەندە یەك ئازادێك بکوژن و لەجیاتی مێ یەك نێرەیەك بکوژن بەلاّم کە ئیسلام هات کێشە کەیان بردەلای پێغەمبەر درودی خوای لەسەر کە ( حکم ) یان بکات لێرەشدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنْثَى بِالْأُنْثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ [1] کە پێشتر باسمان کرد

.

---

١- سورة (البقرة) (١٧٩)

❖وە ئایەتەکە ئاماژە بەمانەی خوارە وە دەکات ..-

١. خوای گـەورە یاسـای سـەردەمی نـەفامی پوچـەڵ کـردەوە وە پێویسـتی کـرد تۆڵەسەندن یەکسـان بێـت لـە کوشـتن دا ،بـەڵام ئەگەرتۆڵەسـەندنەکە یـان هەڵبژارد لەجیاتی لێبووردن وە ویستیان جێ بەجێ ی بکەن ئازادێك دەکوژرێـت گەرئازادێکی کوشتبوو، وە بەندەیەك دەکوژرێت گەربەندەیەکی کوشتبوو، وە ژن لـە جیـاتی ژن دە کوژرێتـەوە واتـە بکـوژ بەرامبـەر بکـوژ، وە ( بەیهـەقی ) گوتویەتی ئەم ئایەتە هاتووە بەرامبەر جۆری کوشتنەکە کەهەرکـەس بـەپێ ی جۆری کوشتنەکە دەکوژرێتەوە وە ڕونی کردۆتەوە کە سزای ئازادێـك چـیەگەر ئازادێکی کوشتبێ وەبەندەیەك بەندە یەکی کوشتبێ یان ئافرە تێك گـەرئافرە تێکی کوشتبێ ،وە ئەم ئایەتە باشتر ڕونی دەکاتەوە کەبکوژ بەرامبەر کوژراو دە بێ سزا وەربگـرێ خـوای گـەورە دە فـەرموێ ﴿کتبنـا علـیهم فیهـا ان النفسـی بالنفسی﴾ [١] واتە ئێمە لەسەر ئـەوانمان واجـب کـردوە کـە لەتـەورات گیـان بەگیان دەکوژرێ وە پێغەمبەر درودی خوای لەسـەر ،ڕوونـی کـردەوە کاتێـك جولەکە یەکی لەجیاتی ژنێك کوشتەوە .

٢. ( مجاهید ) گوتویەتی ئەگەرخاوەن خوێنەکەلێی خوشـبوو دەتـوانێ داوای خـوێن بایی بکات، بە مەرجێك داوایە کەی بەچاکە بێ بێ تونـدوو تیـژی، وە لەسـەر بکوژ پێویستە خوێنە کە یی بدات بەبێ دواخستن و نیازی فێڵ کردن .

---

١-سورە تی مائیدە ئایەتی ٤٥

وە ئەم {حکمە}ی خوای گە ورە دایی ناوە لـە دروسـتی تۆڵـە سـە نـدن و لـێ بووردن دا وەرگرتنی ماڵ لە جیاتی خوێنە کە بەڵگەی ئە وەیە کەخوای گەورە لە گەڵ نەرژانی خوێنێکی نوێیە، لە پاش کەسی کوژراو هەربۆیە بەهەڵ بژاردراوی داندراوە گەرباسی ئەوە بکرێـت باشـە بـۆ پـاش کوشـتنی کەسـێك پێویسـتە بکوژرێتەوە یان ( صلح ) بکرێ، وەلأم لەبەرئەوەیـە تـاوەکو پـاش ئـەم کوشـتنە کێشە زۆر نەبێت و وە بکوژ فێری خوێن ڕشتن نەبێت وەك ترسانێکە .

٣. جا هەرکەسێك دوای ( صـلح ) دەسـت درێـژی کـرد بۆسـەر تـاوان بارەکـە و کوشتی سزای سەختی بۆدەبێت یان بەکوشتنەوەی لە دنیا یان سزای دۆزەخ لە قیامەت ، ( بخاری ) لـە ابـن عبـاس دە گێرێتـەوە کـە پێغەمبـەر درودی خـوای لەسەر کە فەرمویەتی لەناوبەنی ئیسـرائیل دا تـەنها تۆڵـە سـەندنەوە هـەبوو ( صلح ) و خوێن وە رگرتن نەبوو ئینجا خـوای گـەورە بـەم میلەتانـەی فـەرموو (.... كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى ....)[1] واتـە : تۆڵـە سـەندنەوە تـان لەسەر واجب کرا لەجێگای کوژراوە کان

( .. فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ ) [2] واتە ئـەم لێ خۆشـبوونە بـەماڵ وەرگـرتن بەرامبەر کوشتنەکە بەناحەق و بەئەنقەست

---

١- سورة البقرة ١٧٨

٢- ٢- سورة البقرة ١٧٩

تادەگاتە ﴿ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ﴾ واتە:بەدوای کارە چاکە کە بکـەویت واتـە: خـوێن وەرگرتن، داوا لێکراویش بەچاکی خوێنەکەی بدات..

٤. وە ئەم ( تۆڵەیە ) خوای گەورە بۆیە دای ناوە چونکە

أ- هەم یەکسانیە.

ب- هە م مانەوەی ژیان لە پاش تۆڵە دە بەخشێ چونکە گەر پیـاو کـوژبزانێ دە کوژرێتەوە، ئە گەرێتەوە لەکوشتنی خەڵك بەوەش لە لایەکەوە خۆی ئـە ژێنێتـە وە وە لەلایەکی تر ئەوکە سەش ئە ژێنێتە وە کە دەیویست بیکوژێت .

٦- وە ئیسلام خاوەنیەتی هێشتنەوە بۆ سەرپەرشتی کەسی کوژراو .لە داواکردنی جۆری تۆڵە .هەربەم شێوەیە لەلای عەرەب هەبوو پێش ئیسلام ، خوای گەورە دە فەرموێ

﴿ وَمَنْ قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا فَلَا يُسْرِفْ فِيالْقَتْلِ ۖ إِنَّهُ كَانَ مَنْصُورًا ﴾[1] واتە وەهەرکەس بەستەم کوژرا بەبێ حەقێکی شەرعی ئەوە ئەم دە سەڵاتەمان داوە بە خاوەنەکەی تۆڵەبسێنێتەوە وە نابێ زیادەرەوی بکات لە تۆڵە سەندن دا یان شتی تر،چونکەخوا یاریدە دەری زوڵم لێکراوە .

---

١- سورة الاسرا (٣٣)

مەبەست بەسەر پەرشتی ئەوکە سەیە کە داوای خوێن دەکات ئەویش میرات گریەتی . چونکە ئەومافی داواکردنی تۆڵەی هەیە .گەر ئەو داوای تۆڵەسـەندن نەکات ئەوە تۆڵە لەتاوانبار ناسەنرێتەوە .

٧-خاوەنی { المنار }دەربارەی ئەم ئایەتە. دەلیْ: مەبەستی لەم ئایەتە ژیان بە خشینە چونکە کە سێك بزانی بەرامبەر کوشتنی کەسـێك دەکوژرێتـەوە هـەم خۆی توشی تۆڵەسە ندنەوە ناکات وەهەم ئەو کەسەی دەیەوێت بکوژێت.

(( تۆڵە سە ندن لە سە رگیان ))

هەموو کوشتنێك تۆڵەسەندن پێویست ناکات، چونکە جاری وادەبێت ئەم دەست درێژیە ئەنقەست دەبێ وە جاری واهەیە لە ئەنقەست ئە چێ و وە جاری وایە بەهەڵە دەبێت .

یان جگە لەوانە دەبێت، کەواتە پێویستە جۆرەکانی کوشتن روون بکەینەوە وە ئەم جۆرەی تۆڵە دروست دەکات رروونی بکەینەوە.

{ جۆرە کانی کوشتن }

١. کوشتنی قەستی ( عمد )ی
٢. کوشتنی هاو شێوەی قەستی (شبە عمدی)
٣. هەڵە ( خطء)

کوشتنی قەستی / ئەمەیە کە کەسێك بەبێ تاوانی بکوژێت ،کە بەپێی شەرع شایستەی کوشتن نەبێت. بەکەرستەیەك کە لەزۆرینەی کات کوشتنی پێ دەکرێت وەك چە قوو شمشێر تفە نگ..

**وە سزای کوشتنی قەستی ناسەنرێتەوە گەر ئەم خالانەی تێدا نەبێت.**

١-دەبێ ئەم کەسە ژیربێت وپێ گەیشتوبێت ومەبەستی کوشتن بووبێت.. پێغە مبە ر(ص) فەرموویەتی{رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثلاث: عن الصَّبِي حَتَّى يَبْلُغَ، وَعَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يُفِيقَ } (١)

واته:پێنوس لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە شـێت تاهۆشـی دێتـەوە نوسـتوو تـا بەخەبەر دێت منداڵ تا بالغ دەبێت.

**٢-ئەو کەرستەیەی لە کوشتن بەکار هاتوە پێویستە کەرستەی کوشتن بێت ، وەکو چەقۆ و شمشێر و تفەنگ ، بەپاڵ پێوە نانێك لەسـەر زەوی یـان بەشـەقا زلله یەك یان بە مستێك گەر کە سێك مـرد ،ئـەوە تۆڵـەی لێ ناسـەندرێتەوە چونکە کەرستەکە هی کوشتن نیە.**

**قەتلی هاوشێوەی قە ستی (شبه عمد)**

**کوشتنی هاوشێوەی قەستی : ئەوەیەکە کەسێك هەوڵی کوشتنی کەسێك بدات کەخوێنی رەوانەبێت بۆ کوشتن بەکەرستەیەك کە بەشێوە یەکی گشتی خەڵکی پێ ناکوژرێت بەڵام ئەوپێ ی مرد..**

---

١- وأبـو داود (٥٥٨/٤) كتـاب: الحـدود، باب: في المجنـون يسـرق، الحـديث (٤٣٩٨)، والنسـائي (١٥٦/٦) كتاب: الطلاق، باب: من لا يقع طلاقه من الأزواج، وابن ماجه (٦٥٧/١) كتاب: الطلاق، باب: طلاق المعتوه والصغير والنائم، الحديث (٢٠٤١)، وابن الجارود (ص: ٥٩)، باب: فرض الصلوات الخمس، الحديث (١٤٨) كلهم من رواية حماد بن سلمة، عن حماد بن أبي سليمان، عن إبراهيم، عن الأسود، عن عائشة، عن النبي ﷺ قال)) :رفع القلم عن ثلاثة: عن النائم حتى يستيقظ، وعن الصبي حتى يحتلم، وعن المجنون حتى يعقل

وەك ئەوەی بەدارێکی سوکەڵە یان پارچە بەردێکی بچوك یان قامچی یان شـە قازللەیەك لە کەسێك بدات ئـەویش بمـرێ ،کۆمـەلی زانایـانی شـەرع زان و شافعی و حەنەفی بەکوشتنی هاوشێوەی قەستی دادەنێن ( شبە عمدی ).

جیاوازی کراوە لەنێوان منداڵ و پیرونەخۆش بۆ ئەم تاوانە وە بۆیە ئەم ناوەشی لێنراوە چونکە کوشتنەکە لە نێوان ( هەڵە و قەستی دایە )،

ئینجا ئەم کوشتنە تۆڵەی لێ وەر نا گیرێتەوە بە کوشتن بە تەنها خـوێنی لێ وەر دەگیرێت یان ( صلح ) ، لەگەڵ بکوژدەکرێت لەلایەن میرات گرانیەوە..

ئەم ( صلح )ە بۆ ئەوەیە کە کێشەکە بەجارێ کۆتایی بێ لە نێوان میرات گرانی کوژراوو بکوژ جارێکیتر کوشتنوو تۆلە سەندن دروست نەبێتە وە .

**چی لەسەر بکوژ بێویستە**

**یەکەم : کوشتنی بە هە ڵە :-**

ئەم جۆرە کوشتنەیە کەبەهەڵە کەسێك بەر نیشانەی کەسێك دەکەوێت وەك ئەوەی تیرێك بۆ نێچیرێك بهاوی بەر کەسێك بکەوێ ، یان بـەردێك هەڵدەیـە شوێنێکی تاریك بەرکە سێك بکە وێت و بمریت .

واتە ({ قضا و قدر }وە کەسێکی بێ تەکلیف ی شـەرعی وەك منـداڵ و شـێت گەر کەسێك بکوژن بە کوشتنی هەڵە دادەنرێت .

وەك لە فەرموو دەی پێشتر باسمان کرد..

♦ وە ئەم شتانەی کە لەسەرکوشتنی هەڵە پێویستە:-

١- خوێن بایەکی سوک بۆ میرات گرانی دەبێ دابـین بکـرێ ، لـە لایـەن بکـوژ بەمەرجێ زۆرنە بێ، وە دەشتوانێ بە ( اقصاد) بیدات تا سێ ساڵ.

٢-{ کفارە} بدات ئـەویش بریتیـە لـەئازاد کردنـی بەنـدە یـەک ئـەویش هەرمانای ژیان دەبەخشێت، چونکە ئیسلام دژی کۆیلایەتی بوو کەلەنیو نەتەوە کان بلأو بـوو، بەتایبـەتی لـەنیو میلـەتی عـەرەب هەربۆیەشـەریعەتی ئیسـلام بەهۆی { کفارە} بەرامبەر هەندێ تـاوان وایکـردوە خەڵکـە کەلـە بەندایـەتی بەرەو ئازاد بوون ژیانیان نوێ کردەوە، بۆ نموونە کەسوێند بـەدرۆ بخـورێ دە بێ بەندە یەک ئازاد بکات گەر نەبوو ئینجا سێ رۆژ بە رۆژوو بوون یاخود گەر توشی کوشتنی هەڵە بویت دەبێ بەنـدە یـەک ئـازاد بکـەی ، یـان دوو مـانگ لەسەر یەک بە رۆژو بێ گەر سەیری دە قەکە بکەین دە بیـنین خـوای گـەورە مافی خەڵکی پێش مافی خۆی خستوە .

زانایان کۆ دەنگیان لەسەر ئەوەیە کە دەبێ بەندەیەکی ئازاد بکرێ گەر بەنـدە نە بوو بۆ ئازاد کردن ئینجا بەرۆژو بوون ئەم رۆژو بوونە سزایەکە بۆ کەسەکە کەزیاتر پارێزگاری لەگیانی خـەڵک بکـاو بزانـێ کـەتاوانی کـردوە ،پـاش ئـەم دووسزایە یـەک لـەدوای یەکـە ئینجـا نانـدانی هـەژاران وەک سـزا دانـراوە کەبەرامبەر تاوانەکان دەبێ نان بدرێ بەهەژارە کان، ئینجـا یـان (١٠) هـەژاریان زیاتربەپێ ی تاوان هـەموو یاسـایەکەش پاڵپشـتی هـەژارو لێقەوماوانـە، ئینجـا

خوایگەورە دەفـەرموێت ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَأً وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلَّا أَنْ يَصَّدَّقُوا فَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ عَدُوٍّ لَكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِنَ اللَّهِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ [1] واتە:هیچ باوەردارێك بـۆی نیە دەست درێژی بكات بۆسەر برواداریێك مەگەر بەهەڵە رووبدات، جـا هـەر كەس باوەڕدارێكی بەهەڵە كوشت ئەبێت بەندەیەكی بـاوەڕدار ئـازاد بكـات و خوێن بایشی بدات بە كەسوكاری كوژراوەكە ،مەگەر خۆیان لیٚ ی ببورن، بەلاٚم ئەگەر كوژراوەكە باوەڕداربوو دەبیٚ بكوژەكە بەندەیەكی بڕوادار ئازاد بكـات، وە ئەگەر لەنەتەوەیەك بوو با( كافر )یش بیٚ بەلاٚم تەسلیم بە یاسـای ئیسـلام ببوون دەبیٚ بە ندەیەكی موسڵمان ئازاد بكا ، خوێن بایشـی بـدات بـە كەسـو كاری كوژراو.

---

١- سوره النساو الایه ٩٢

وەئەگەر کەسێک دەسەلاتی بەخشینی بەندەی نەبوو، دەبێ دوومانگ بـە رۆژو بێ  بێ پچرانەوە..

تا خوای گەورە لێ ی خۆشبێ، واتە خوای گەورە زانایە بە کارو باری بەندە کانی و کار دروستە.

جا سەیری دەقی ئەم ئایەتە بکەین دە بینین خوای گەورە لە مافی ژیان هیچ جیا وازی ناکات لە نێوان باوەر دارو بێ باوەر {ئیماندارو کافر} لە مافی ژیان ..

وەزانایان دەفەرموون لەم کوشتنەگەر کۆمە لێک بەژداربوون دەبێ کۆمە لەکـە هەموو  وابەستەی ئەم یاسایەبن..

**سێ یەم : کوشتنی هاوشێوەی قەستی (شبەالعمدی ):.**

**ئە مانەی لەسەر پێویست ئەبێ**

١-گوناح : تاوان باردەبێت. ئەویش پەیوەسـتە بەقیامەتـەوە چـونکە رەوانیـە مرۆڤ ببێتە هۆکاری کوشتنی کەسێک لەشەریعەتی ئیسلام، ئینجا خـوای گـەورە لە قیامەت بە گوێرەی کەمتەرخەمیەکەی  سزای دە دات .

٢-خوێن بایی قورسی دەکەوێتە سەر . دەبێ بکوژ نا چار بکەن بیدات.

## دووەم : بکوژی قه ستی ( عمدی )

ئەمانەی پێوە پەیوەست دەبێ .

١. گوناح باردەبێت. کە پێشتر باسمان کرد کە لە قیامەت خوای گـەورە چ جـۆرە سزا یەکی دە دات .

٢. بێ بەش بوون لەمیراتی کوژراو . واتە کەسێك کەسێك بکوژێت وەك دایك یا باوکی خۆیی یان باپیری یان برا ،دوایی بەشەمیراتی بەرناکەوێت لـەم کەسـەی کە کوژراوە بەمەرجێك گەر میرات گرانی لێ ی خۆش بن .

٣. ( کەفارەت ).

واتە ئەگەر خاوەن خوێن لەکەسەکە خۆش بوون کە هەڵساوە بەکوشتنی کە سێك لەوان، خوایی گەورە بەم سانایە لێ خۆشنابێت لە قیامەت سزاوەر دە گرێ و لە دنیاش دەبێ بەندە یەك ئازاد بکات لە ( نیل الاوطار ) بە درێژی باس کراوە لە فقهی سونە ئیمام سید سابق لاپە رە ١٠٢ بە درێژی باس کراوە ، بەڵام ئەگەرکابرا لە جیاتی کوژراو کوژرایە وە ئە وا بەبەر کەفارەت دەکە وێت .

٤. کوشتنە وە یان لێ بووردن: لەشـەریعەتی ئیسـلام وەك پێشـتر باسمـان کـرد چەند جۆرە سزایەك بۆبکوژ دانراوە گەرخاوەن خوێن لەمافی خۆی خـۆش بـوو بە ( صلح ) ، یان بەبێ خوێن ئەوا خوای گەورە دە ست بە رداری نابێت سـزای لێ وەردە گرێتەوە، ئەویش بە ( کە فارە ) دان لە دنیاو سوتان لە قیامەت

بەلاّم بۆ ئەوەی لە ژیان زەخیرەی تاوان بەرە و زیاتر نەچێت ،خـوێن نـە هێتـە دوایی خوێن . « وە بەکوشتنە وەی بکوژ کوژراو زینـدوو نابێتـە وە » بۆیـە گـە رخزم و کەس واتە میرات گرانی کوژراو لە بکوژ خۆش بن دادوە ری موسـلمان تۆڵە لە بکوژ وە رناگرێتە وە .

## مەرجەکانی پێویست بوونی { تۆڵە } سزا.

بۆ وەرگرتنەوەی تۆڵە و سزادانی بکوژ کە هەڵساوە بەرڕژاندنی خوێنی کەسـێك دەبیٚ ئەم مەرجانەی تێدابێت ،تا بێت کەسێك بەبیٚ ئەم مەرجانە بکوژرێت...

١. ئەبیٚ کوژراوە کەبیٚ تاوان بێت ..

٢. بکوژدەبیٚ پێگە یشتوو بێت — بالغ - (بە رفەر مودە روونمانکردەوە)

٣. بکوژ ژیر بێت . — عاقل - لەپێشتر بە فەر موو دە رونمان کردەوە )

٤. کاتێك تۆڵە سەندن گیرادەبێت کە کەسەکە دان بە کوشتنەکەدابنیٚ یان دووشا هێدی لەسەر هەبێت کە نزیکی کارەکەبێت ،نابێت ئەم دووشاهێدە یەکێکیان ئافرەت بێت، چونکە بابەتی کوشتن لە دەرەوەیە ،ئافرەتیش لەماڵە وەیە رەنگە لەم شوێنە نەبوبێت یان رەنگە رازی کرابێت یان زۆریان لیٚ کرد بێت بۆ شاهێدی درۆ، بەلاّم لە هەندیٚ کات پیاو بەشاهێد ناچیٚ تەنها ئافرەت بەشاهێد دەچیٚ، بۆ نموونە:شیردانە مندال —خۆکوشتنی ئافرەت. کاروباری ئافرەت ...هتد

## ژیان و ژیانەوە

جگە لەوەی ڕێز لەژیان و مافی ژیان بە مرۆڤ دراوە لە ئاینی ئیسلام ، تەنانەت کۆر پەی نێوسکی دایکیش مافی ژیانی هەیە، جاهەر کسێک بێتە هـۆی ئـەوەی کە کۆرپەیەك لەنێو بەرێت ئایە بە لێـدانی دایکـی بێـت ببێتـە هـۆی ئـەوەی مندالەکەی لە بەربچێ یان بە لەبار بردنی دایکی، کە خۆی بیە وێت منداڵەکـە لەبار بەرێت، دەبێ ئەو کەسە ( خوێن بایی و فدیەش بدات ) ،لێرە درێژە بـە بابەتەکە نادەم بەڵام ئە وەندە دە خە مەروو کە وەك مرۆڤی زیندوو مامە ڵـە ڵەگەل تاوانەکە دەکرێت، وە پێویستە بەرامبەر ئەم تاوانـە بەندەیـەك ئـازاد بکات ،ئەمەش هۆیەکە بۆئەوەی هەم وەچە بخەنە دنیا و ، وە ژیانیش لە مرۆڤ قەدەغە نەکرێت ، وەهەم مرۆڤ  فێری خۆپارێزی دەکات لە بچوکترین کوشتن وە هەروەها هۆیەکە بۆئەوەی کەسێك لـە بەندایـەتی رزگـار بکرێـت ، ئـازاد ببێت بەهۆی ( کەفارەتی ) ئەم تاوانە..

لێرە ئیسلام مندالێك بە کاردەهێنیت بۆماف دان بە ژیان و ئازادی مرۆڤایە تی و نەهێشتنی دابی کۆیلایەتی و بەندایەتی، لەسەر دەمانی پێش ئیسلام گەر لەجەنگ کەسێك بە دیل بگیرا بایە یان دەکوژرا یانیش دەکرابەکۆیلە کەخۆی لەخۆیدا ئەویش هەرکوشتنێکە، بەڵام ئیسلام جیا لەگشت نەتەوەو دەسەلاتێك کە لەدەوروو پشتی نیمچە دورگەی عەرەبیان گرتبوو رێزێکی زۆری لەمرۆڤ نا و

خەڵکی لە کوشتن و کۆیلایە تی ئازاد کرد ، لە ئیسلام دەبوایە دیل ئازاد بکرێن بێبەرامبەر وە زۆر جار لە جەنگەکان ئەمە رووی ،داوە وەیان بە بەرامبەر دەدرایەوە دەست کەسو کاری، یان دەگۆردرایە وە بەدیل ،بۆ نمونە فەرموودە یەکە دەهێنرێتەوە کەپێغەمبەر درودی خوای لەسەرکە پیاوێکی {بەنی عقیل} ئازاد کردبە رامبەر بە دوو موسلمانی دیل[1]

خوای گەورەش دەفەرمووێت﴿ فَإِذا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنْتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ذَلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَانْتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَكِنْ لِيَبْلُوَ بَعْضَكُمْ بِبَعْضٍ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَنْ يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴾[2]

واتە:گەر گەیشتی بەوانەی بیٚ باوەرن لە مەیدانەکانی جەنگ لەملیان بدەن وە کاتێك بەکوشتن کاری زۆر لاوازتان کردن هێزو تواناکانتان شکاندن دیلەکان باش پەروەر دەبکەن، ئیجا منەتیان بەسەر دابکەن و ئازادیان بکەن یان بەبەرامبەر بیانگۆرنەوە ، لێرە:خوای گەورە باسی ئەم کاتە دەکات کەبێبرواکان رێگەلە موسڵمانان دەگرن و شەریان پێدەفرۆشن ،چونکە هەرگیز موسلمان یان شەریعەتی ئیسلام رێگەی بەوە نەداوە هەڵکوتنەسەرخەلك و زوڵمیان لێبکەین

---

١- ئیمامی ئەحمەد بەژمارە{٤٢٦} و ترمزی بە ژمارە {١٥٦٨}

٢-سورة (محمد) (٤)

گەر سەیری شەڕی ( بەدرو ئوحد و خەندەق ) بکەی هـەمووی هـەربێ بـاوەرە دێتە سەر شاری موسڵمانان لە هەمانکات لەهەر سێ جـەنگ ( موسـلمان و یـە هودی و مەسیحی ) بە یەکەوە بەرەنگاری کافرەکان هاتنەوە،

ئینجا خوای گەورە لە سیاقی ئەم ئایەتە باسی ( ألمن ) دەکات واتە با ئێوە لەوان چاکتربن بیاندە نەوە با ببێ بەمنەت لەسە ریان ،بەلأم ئەگەر دیلی ئێوە کەوتە دەست ئەوان دیلەکان ئاڵ و گۆڕ بکەن، وە دەشبێ بەرامبەر ئە و زیانەی لە جەنگ بەر موسڵمانەکان دەکەوێ بە پارە یان بەهەرشتێ دیلەکان بگۆرنە وە فەرموو دەیەک لەئەنەسە وە دەگێرێتەوە، کە پێغەمبەر ئە وانەی بە دیل گرتن ( هەشتا ) کەس بوون ئازادی کردن لە کێوە کانی ( تنعیم ) ، هە رچەندە لە نوێژی بەیانی هەڵیان کوتابونە سەر موسڵمانان تا بیان کوژن ،بەلأم پێغەمبەر ( منە تی ) بەسەرداکردن ئازادی کردن..[1]

لێرە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُمْ بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنْ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا﴾[2]

---

١-( مسلم ) (١٨٠٨\١٣٣) - ئە یمام ئە حمد بە ژمارە (١٢٤٣) -ئە بوو داود (٢٦٨٨) ترمزي (٣٢٦٤)

٢- سورة ( الفتح ) ( ٢٤ )

واته : خوای گەورەبو دەستی ئێوەی لەوان گێرایەوەو دەستی ئەوانی لەسەر ئێوە گێرایەوە لە ناو مككە كە ئێوە بەسەریان زاڵ بوون ئێوە ئازادتان كردن ، وە هەروەها پێغەمبەر درودی خوای لەسەرلە ( فتح المكە ) فەرمووی بەو كافرانەی كەخوێنی چەندین موسلمانی بێ تاوانیان ڕژاند و چەند ئابلوقەی ئا بووری یان دان بە هەزار شێوە، تا وایان لێكردن لە ولآتی خۆیان دەربەدەربن، ئینجا بیفەمبەری ئیسلام لەكاتی بەهێزی له( فتحی مكە ) پێی گوتن ( اذ هبوا فأنتم الطلقاء ) بڕۆن ئێوە ئە ی بێبرِوایان ئازادن .

ئینجا بزانە هیچ یاسایەك هیچ دەوڵە توو هێزێك هێندە شـەریعە تـی ئیسـلام رێگر نەبووە لە ڕژانی خوێنی مرۆڤ .

خوایی گەورە ئامۆژگاری پێغەمبەر دەكات دەفەرمویٚ ﴿مَا كَانَ لِنَبِيّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى﴾[1] واتە بۆ هیچ پێغە مبە رێك نیە دیلی هەبێت . هە ربۆیە كۆمەڵێك زانا لە وانە زوهری و موجاهید وتویانە لەپاش ئەم ئایەتە دەبیٚ دیل ئازاد بكریٚ و بیٚ بەرامبەر ،چەندین فەرموو دەمان هەیە بەرامبەر ئازاد كردنی دیل و ڕێز لێگرتنیان لەلایەن موسلمانان..

---

١- سورة ( الانفال ) ( ٦٧ )

ئێمە نابێت ئەوەمان لە بیرچی کە لەسەردەمی پێغەمبەر درودی خوای لەسەرلە کە بێ باوەڕەکان بەرۆکی موسڵمانانیان دەگرتوو شەڕیان پێ دە فرۆشتن سوکایە تیان بەماڵ و منداڵیان دەکرد، لە بەرەیی جەنگیش کەس زۆری لەتاکی کوفر نەکردبوو کەبێنە بەرەی جەنگ بەڵکو بەپێچە وانەوە بە ئارە زووی خۆیان بەوپەڕی خۆشیەوە دەهاتن بۆ گرتنی بەرۆکی موسلمانان..

ئینجا پێغە مبەر درودی خوای لەسەرلە بەو پەڕی هێمنی و ئارامی مامە ڵە ی لەگەڵ دەکردن، گە ر سە یری ڕژیم و دەسەلأت و هێزەکانی تری مێژوو بکەین سەیر دەکەین خەڵك ناچار دەکرێت بۆ هێنانی بۆ بەرەی جەنگ یان بە هەرەشە یا بەترس و کوشتن و نان بڕین یا بەرامبەر پارە یەك لە ترسی برسیەتی، ئینجا دیلەکان سزاو ئە شکە نجە دە درێن وە لە سێدارەش دراون، بەلأم وەك باسمان کرد بێ بڕواکان خۆیان تینوی خوێنی موسڵمانان بوون.. ئینجا پێغەمبەر درودی خوای لەسەرلە فێری موسلمانانی کرد کە بەو پەڕی نەرموو نیانیە وە مامەڵە بکەن ئازادیان بکەن، خوای گەورەش دەفەرموێ ﴿ وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا–إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاء وَلا شُكُورًا ﴾[(١)]

---

١- سوره(النساء ) ٨-٩

واتە خواردە مەنی ئەدەن هەرچەندە خۆیان حەزیان لێیە تی و پێویستیان پیٚ یـە تی بەڵام ئە یدەن بەهەژار و بیٚ باو کو دیل .

وە لە دەڵیٚ خۆیان دەڵێن ئێمە لەڕێی خودا خواردنتان ئەدەینیٚ نە پاداشتمان لـە ئێوە دەویٚ نە سوپاس .

سەیری جوانی دڵی موسلمان بکەن لەبەر ڕۆشنایی شەریعەتی خودا کـە ئەوکـە سەی هاتووە خوێنی برژێنی کەچی ئەو بەزەیی بە بەرامبەری دادێتەوە .

ئەبوموسایی ئەشعەری لە پێغەمبەرە وە دەگێرڕتـە وە کـە فەرموویـەتی ( فکـوا العانی، وأگعموا الجائع، وعُودوا المریچ ) [1]

واتە دیل ئازاد بکەن برسی تێر بکەن سەردانی نەخۆش بکەن .

جارێک ( ثومامة کوری اثال ) بە دیل دەکەوێتە دەستی موسڵمانان دەیبەنە لای پێغەمبەر درودی خوای لەسـەرلە ئـە ویـش فـەرمووی ( احسـنوا أسـارە ) واتـە بەچاکی مامەڵەی لەگەڵ دابکەن .

وە فەرمووی هەرچی خواردەمەنیتان هەیە بـۆی ببـەن وە هـەموو بەیانیـەک و عەسرێک لەشیری وشترەکەی پێغەمبەریان دەدایٚ وەپێغەمبەر داوایی لـیٚ کـرد موسلمان بیٚ کەچی موسلمان نەبوو وتی ئەگەر داوای بەرامبەردەکەن چەندتان دەویٚ بەرامبەر ئازاد کردنم پێتان دە دەم..

---

١- بخاری (٣٠٤٦)

بەڵام پێغەمبەر بێ بەرامبەر ئازادی کرد لەپاش ئەم هەڵوێستەی پێغەمبەر دروردی خوای لەسەر خۆی بۆ خۆی ئیمانی هێناو موسلمان بوو {ثمامة بن أُثال الذي جئ به أسيراً إلى النبى صلى اللّه عليه وسلم ، فأمر به فربط بسارية المسجد ، وكان الرسول صلى اللّه عليه وسلم يمر به فيسأله :ماذا عندک يا ثمامة ؟ فيقول : عندي يا محمد خير ، إن تقتل تقتل ذا دم – أي أستحق القتل لأني قتلت من المسلمين – وإن تُنعم تُنعِم على شاكر ، وإن كنت تريد المال فسل تُعط منه ما شئت ، ثم أطلقه صلى اللّه عليه وسلم بعد ثلاث بغير فداء نفانطلق إلى نخل قريب من المسجد فاغتسل ثم جاء إلى النبى صلى اللّه عليه وسلم وشهد شهادة الحق } .[1] پێم سەیرە کەسێك لەژێرئاینی ئیسلام بێت تۆش ئەم دەقە پیرۆزانەو چەندین بەسەرهات و هەڵوێستی تری شەریعەتی ئیسلام ی بەبەڵگە ۆبێنی کەچی بڕوای وایە کەئیسلام توندەو هیچ میانەرەوی تێدانیە، هەندێ لە خەڵکی موسڵمان و غەیری موسڵمانیش لایان وایە شەریعەتی ئیسلام دژی هەموو شەریعەتێکە.

پاش ئەم بابەتە کەرەنگە شتێك فەرمانی شەریعەتی ئیسلامی بێ ئێمە بەرچاومان روون بوبێتەوە بەوەی کەئیسلام کەس بە زۆر نا خاتەژێر رکێفی خۆی و کەسیش بە ناوی ئاین نابێ بکوژرێت، بەڵکو کافر و موسلمانی ئیماندارو بێ ئیمان مافی ژیانیان هەیە و خوێن رشتن و ستەم کردن لەئیسلام

---

١- القصه أخرجها البخارى (٤٣٧٢) ومسلم ( ١٧٦٤) من حديپ أبى هريره)

لەپێشی هەموو تاوانێکە یەکەم تاوان کەوە چەی ئادەم کردی تاوانی کوشتن بوو.

بۆیە ئیسلام وشەریعەتەکانی خودا هەمووی دژی رژانی خوێنە بە تایبەت پەیامی محمد درودی خوای لەسەرلە کە جوانترین و رێکترین پەیامە کە مافە کان بۆ ژیان دابین دەکات بەڵکو رێزلە دارو بەردیش دەنێت.

هیچ بیانویە ك نیە تە نانەت بەناوی دینیش کە کەسێك کەسێك بکوژێت..

## دەست درێژیکردنە سەر گیان وناموس و ماڵ

خۆ ئەگەر کەسانێك دەستدرێژیان کردە سەر گیان و نامووس وماڵ، ئەوە واجبە بەرەنگاریان ببنەوەو، دەستدرێژی و دوژمنکاریان لە خۆیان دورخەنەوە،

وەك ئەم فەرمودانەی خوارەوە:

١-پێغەمبەر(ص) دەفەرموێت (( من قتل دون ماله فهو شهيد،)) [١]

واتە: ئەوەی لە پێناوی ماڵەکەی بکوژرێت شەهیدە.

٣-عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ : جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إِنْ جَاءَ رَجُلٌ يُرِيدُ أَخْذَ مَالِي ؟ قَالَ : فَلَا تُعْطِهِ مَالَكَ ، قَالَ : أَرَأَيْتَ إِنْ قَاتَلَنِي ؟ قَالَ : قَاتِلْهُ ، قَالَ : أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلَنِي ؟ قَالَ : فَأَنْتَ شَهِيدٌ ، قَالَ : أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلْتُهُ ؟ قَالَ: هُوَ فِي النَّارِ [٢]

---

١-أخرجه أبو داود (٢ / ٢٧٥) والنسائي والترمذي (٢ / ٣١٦) وصححه، وأحمد (١٦٥٢) ١٦٥٣) عن سعيد بن زيد، وسنده صحيح .وفي رواية "" من قتل دون مظلمته فهو شهيد " "أحكام الجنائز ١/٤٢"

٢-. رواه مسلم ( ١٤٠.)

وعَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنه قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : ( مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دِينِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دَمِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ )[1] واته: پیاوێك هاته لای پێغەمبەر درودی خوای لەسەر پرسی ئەی پێغەمبەری خوا رات چیه ئەگەر کەسێك بێت ماڵم ببات؟ فەمووی ماڵەکەتی مەدێ- کابرا گووتی ئەی ئەگەر شەری لەگەڵدا کردم؟ فەرمووی شەری لەگەڵ بکە کابرا گووتی ئەی ئەگەر منی کوشت؟ فەرمووی:تۆ شەهیدی کابرا گووتی ئەی ئەگەر من ئەوم کوشت؟ فەرمووی: لە ئاگردایە.

٣-پێغەمبەر درودی خوای لەسەر دەفەرموویێت

من قتل دون ماله فهو شهيد، ومن قتل دون أهله فهو شهيد، ومن قتل دون دينه فهو شهيد، ومن قتل دون دمه فهو شهيد[2]

---

١- رواه الترمذي ( ١٤٢١ ) والنسائي ( ٤٠٩٥ ) وأبو داود ( ٤٧٧٢ ) وصححه الألباني في " إرواء الغليل " ( ٧٠٨)

٢- أخرجه أبو داود (٢ / ٢٧٥) والنسائي والترمذي (٢ / ٣١٦) وصححه، وأحمد (١٦٥٢) (١٦٥٣) عن سعيد بن زيد، وسنده صحيح .وفي رواية "" من قتل دون مظلمته فهو شهيد" " أحكام الجنائز ٤٢/١"

**واتە: ئەوەی لە پێناوی- پاراستنی- مالی دەکوژرێت شەهیدە، ئەوەی لە پێناوی پاراستنی- دینی دەکوژرێت شەهیدە، ئەوەی لە پێناوی گیانی دەکوژرێت شەهیدە، ئەوەی لە پێناوی خانەوادەی دەکوژرێت شەهیدە..**

**لەو فەرموودانەش پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بەرەهایی فەرموویەتی ئەوەی بێتە سەرماڵت، جا چ موسلمان بیت یان نا موسلمان، واجبە بەرەنگاری ببیتەوە، بەهەمان شێوە ئەوەی دەست درێژی دەکاتە سەر مال و خاکت، یان مال و منداڵ و خانەوادەت، واجبە رێیان لێ بگری و بەرەنگاریان ببیتەوە، جائەگەر لەوناوەش کوژرای شەهیدی، چونکە دیفاع لەخۆت و ماڵ وناموست و خانەوادەت دەکەیت..**

**بۆیە بەپێ ی ئەم فەرموودانە جێگەی خۆیەتی دیفاع لە خاك ولات و نیشتیمان و گەلی خۆی بکات لەهەر دەست درێژیکردنەسەرێك..**

## مامەلە کردن لەگەل دیل

کاتێك باسی چۆنیەتی مامەلەکردن لەگەل دیل دەکەین، مەبەستمان ئەو دیلانەن کەموسلمان نەبونەو، کەوتونەتەدەستی موسلمانان، بۆیە ئەگەر مامەلەی  باش لەگەل دیلێك پێویست بێت کە دوژمنی موسلمانان بوبێت و، ستەمێکی زۆریان لە موسلمانان کردبێت، ئەوە بۆ موسلمانان چەندبارە دەبێ چاکتربێت..

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆز بەروونی باسی ئەو حالەتە دەکات، کەچۆن موسلمان مامەلە لەگەل ئەسیرو دیل بکات، دەفەرموویێت: ﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا (٨) إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنْكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا﴾[١]

واتە: لە خۆشەویستی خواو بۆخاتری خوا، خواردەمەنی دەدەنە برسیو هەتیو و دیل. پێشیان دەلێن: خواردنتان هەر لەبەر رەزامەندی خوا دەدەینێ و پاداشت و سوپاسی ئێوەمان ناوێ.

---

١- سورەتی الانسان  ئایەتی  ٨-٩

ئەگەر ورد  بینەوە لەم ئایەتە دووخالی زۆرگرنگی تێدایە،

**یەکەمیان: دەکاتە ئەرک لەسەر موسلمانان کە چۆن پێویستە هاوکاری کەم دەرامەت و هەتیوان بن، بە هەمان شێوە دەبێت هاوکاری دیل و گیراوانی جەنگیش بن.**

**دووەمیان: فێرمان دەکات کاتێک موسلمان ئەم کارە دەکات، تەنها مەبەستی رەزابوونی خوای تەعالایەو، بەدیلەکە دەلێت: بۆئەوە هاوکاریتان ناکەین تا ببێتە منەت بەسەرتانەوە، بۆیە نە چاوەروانی پاداشت و نە چاوەروانی سوپاسی ئێوەین..**

**چونکە ئەم کارە خێرنیە بەڵکو ئەرکە دەبێ بەرامبەر دیل بینوێنین..**

**ئەم حالەتەش بۆ ئەوەیە دیل بەگرتنی لەرووی دەروونیەوە دادەرمێت بۆیە ئیسلام نایەوێت زیاتر دەروونی بروخێت، بەلکو لەو حالەتە نا خۆشەیدا هانی دیل دەدات تا ورەی بەرزبکاتەوە.**

**شەری بەدر یەکەمین تاقیکردنەوەی هەلس و کەوتی موسلمانانەبوو لەگەل دیلەکان، ئەوانەش کە لە شەری بەدر بونە دیل بریتی بوون لە ( ٧٠ ) کەسی خەلکی مەکە،**

**ئەوانە مرۆڤی ئاسایی نەبوون بەرامبەرموسلمانان، پێشتر هەرچی لەدەستیان هات بوو دەرهەقی موسلمانان ئەنجامیاندابوو، هەندێکیان شەهیدکردن،داخیانکردن، هەتکیانکردن، سێ ساڵ لەدەرەوەی ئاوەدانی**

گەمارۆی ئابوری و کۆمەلایەتی و... خستە سەریان، تالە برسان پەلك و گەلای داریان دەخوارد و مندالەکانیان لەبرسان مردن، لەمەککە دەریانکردن، مالیان لێ زەوتکردن، هەرچی هەلمەتی راگەیاندن هەیە لەدژیان خستیانە گەر، بەلام کاتێك لەشەری بەدر ئەوانە بە دیل کەوتنە دەستی موسلمانان، یەکەمین ئامۆژگاری پێغەمبەری رەحمەت درودی خوای لەسەر ئەوەبوو فەرمووی: عن أبو عزيز بن عمير - وهو ممن أسر فى بدر، وهو أخو مصعب بن عمير - يقول: "كنت فى نفر من الأنصار، فكانوا إذا قدَّموا غداءهم وعشاءهم أكلوا التمر وأطعموني البُرَّ لوصية رسول الله صلى الله عليه وسلم إياهم

واتە: لەرۆژی بەدر من لەناو دیلەکان بووم، جا پێغەمبەر درودی خوای لەسەر فەرمووی: {وەسیەت بێت لەگەل دیلەکانم باشبن}، لەگەل کەسانێکی ئەنساری بووم، کاتێك نانی نیوەرۆ و شیوی ئێوارەیان دەخوارد، ئەوان قەسپیان دەخوارد و نانیان دەدایەمن لەبەر وەسیەتی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر..

لە شوێنێکی دیکە باس لەوە دەکات: ئەگەر پارچە نانێك لەدەستی یەکێکیان بکەوتایە خوارەوە پێشکەشی منی دەکرد، منیش شەرمم دەکرد، بەلام دەستی لێ نەدەداو بۆمنی رەواندەکردەوە[٢]

---

١- ابن هشام: السيرة النبوية، القسم الأول (الجزء الأول والثاني) ص٦٤٥.

٢- {السيرةالنبويةلابي الندوي ٣١٣}

## بەرگ وخوراکی دیل

کاتێک کەسێک دەبێتە دیلی موسلمانان پێویستە خواردەمەنی وجل و بەرگیشی بۆدابین بکەن، بۆیە کاتیک پیاوێکی سەقیف دەبێتە دیلی موسلمانان پێغەمبەر(ص) بەلای دا تێدەپەڕی، کابرا بانگی دەکات [(١)]

واتە: بانگی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر دەکات ئەویش تەشریف دێنێتە لای، کابرا دەلێت: برسیمە خواردنم بدێ، تێنیمە ئاوم بدێ،ئەویش دەفەرمووێت: {ئەوەپێویستی تۆیە}.. واتە: ئەوە وەک پێویستیەک دەبێ بۆت دابین بکرێت.لەبارەی، جل و بەرگیش، ئیبن حەجەر فەرموودەیەک دەهێنێتەوە:

لَمَّا كَانَ يَوْمَ بَدْرٍ أُتِيَ بِأُسَارَى ، وَأُتِيَ بِالْعَبَّاسِ وَلَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ ثَوْبٌ ، فَنَظَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَهُ قَمِيصًا فَوَجَدُوا قَمِيصَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيّ يَقْدُرُ عَلَيْهِ فَكَسَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِيَّاهُ [(٢)]

---

١–فناداه . فقال : يا محمد ! يا محمد ! فأتاه فقال ( ما شأنك ؟ ) قال : إني جائع فأطعمني . وظمآن فاسقني . قال ( هذه حاجتك ( مسند احمد بن حنبل ٣٣/ ١٢٤/ ( ١٩٨٩٤)

٢– فتح الباري شرح صحيح البخاري ٣/ ٢١٥

واتە: لەرۆژی بەدر دا، چەند دیلێکیان هێنان و عەباسی( مامی پێغەمبەریشیان بەدیلی) هێنا، هیچ بەرگی لەبەر دانەبوو، ئەوانیش تەماشایانکرد تەنها کراسە کەی عبداللە ی کوری ئوبەی بۆدەبوو چونکە درێژبوو، هێنایان و پێغەمبەر خستیە بەری..

## چارەنووسی دیل

لیرەدا بەپێویستی دەزانم ئەوە دووبارە بکەمەوە لەو کاتەی ئێمە باسی ئەحکامەکانی دیل و چۆنیەتی مامەلە کردن لەگەلی دەکەین،باسی کەسێکمانە کەدیلێکی ناموسلمانەو هەرەشە بووە لەسەر موسلمانان، واتە ئەو نامەیە بۆکەسێکی موسلمان نییە، چونکە شەرکردن لەگەل موسلمان دروست نیەو، ناکرێ بکرێتە دیلیش، هەروەها بۆ ئەو موسلمانانەش نییە، کەبە ئاشتی لەگەل موسلمانان دەژین وکێشەو گرفتیان نەنایتەوە، هەروەها لەگەل ئەوموسلمانانەش نییە کەلە ولاتی خۆیانن و هیچ شتێکیان دەرهەقی موسلمانان نەکردووە، بەلکو باسی ئەوانەمانە کە ناموسلمانن و هێرش دێننە سەر ولاتی موسلمانان و ئاینیان قەدەغەدەکەن یان مولك و مالیان داگیردەکەن، یان هەرەشەی کوشتنیان لێدەکەن، لێرەدا کەسانێك لەوانە دەبنە دیل و ئەو مامەلەی سەرەوەیان لەگەل دەکرێت و چۆنیەتی خاڵەکانیش لەلایەن گەورەی موسڵمانان جێبەجێ دەکرێت،کەواتە ئەو دوژمنە نا موسلمانەی هاتۆتەسەر مان و هەرەشە لەدین وگیان ومالٚ و نامووس و خاکمان دەکات، بووە دیل و کەوتە دەستی موسلمانان، گەورەی موسڵمانان بەو رێگایانە چارەی دەکات..

## ئازاد کردنی دیل یەکەم : بێ بەرامبەر

کاتێك دەربارەی چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ دیل تەماشای قورئان دەکەین،دەبینین تەنها دوو بژاردەی داوەتە دەست سەرۆکی موسلمانان، یەکەمیان ئەوەیە دیلەکە بێ بەرامبەر ئازاد بکەن، بەلاّم ئەو ئازاد کردنە لە کاتێکدایە کە بەرژەوەندی تێدایە،واتە مانای ئەوە نییە، هەرکەلەشەر تەواو بوون، و چەکدارێکی دوژمنیان بە دیل گرت یەکسەر بینێرنەوە، چونکە لەوانەیە یەکسەر بچێتەوەو دووبارە دەست بداتەوە چەك، یان هەرکە ترسان خۆیان بدەنە دەست، چونکە دەزانن زوو ئازاد دەکرێن، بەڵکو رەچاوی بەرژەوەندی دەکەن، ئایا زوو ئازاد بکرێن یان بۆماوەیەك بمێنێتەوەو، بۆزانیاری سوودی لێ وەربگیرێت، یان دوای بخەن تا لەرووی چاك سازیەوە رێگەی بۆدەدۆزرێتەوە..

لەوبارەیەوە خوای گەورە دەفەرموویێت ﴿...فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً....﴾(١)

واتە: یان بێ بەرامبەر ئازادیان کەن یان بەوەرگرتنی بەرامبەر ئازادیان کەن لەو ئایەتە پیرۆزە دا دەبینین ئازاد کردنی بێ بەرامبەر یەکەمین بژاردەی قورئانە لەبەردەم موسلمانان لە ژیان نامەی سەرداریشمان کۆمەڵێك نموونەی لەو بارەوە دەبینین، وەك: لەشەری بەدرکۆمەلە دیلێك بێ وەرگرتنی هیچ شتێك ئازادکران،

---

١- سورەتی (محمد) ئایەتی ( ٤ )

لەوانە {ئەبولعاصی کوری رەبیع، و موتلیبی کوری حەنتەبی مەخزومی کە دواتر موسلمان بوو، وە صەیفی کوری ئەبی روفاعە ی مەخزومی، عەمری کوری عەبدولای کوری عوسمان ناسراو بە ئەبوعەزەی شاعیر جومەی حی}

کاتێك باسی هەژاری و حالی کچەکانی خۆی بۆ پێغەمبەر کرد و داوای ئازادکردنی لێکرد، ئەویش سۆزی بۆ جولاو بیٚ هیچ بەرامبەرێك ئازادی کرد ، هەروەها {ثمامە ی کوری ئوثال}ی گەورەی خەلکی یەمامە بەنیازی کوشتنی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر دێتە شاری مەدینەو دواتر ئاشکرا دەبێت و پشتی هەندێك قسەو گفت وگۆ پێغەمبەر درودی خوای لەسەر دەفەرمووێت: (( اطلقوا ثمامة ))[1] ( ثومامة ) ئازاد کەن، ئیدی بیٚ هیچ بەرامبەرێك ئازاد دەکرێت بەلام ثومامة دەچێتە ناو باخچەیەکی خورمای نزیك مزگەوت خۆی دەشوات و دەگەرێتەوە یەکسەر موسلمان دەبێت بەهۆی ئەویشەوە چەندان لە هۆزو عەشیرەتەکەی موسلمان دەبن.. هەروەها لەفەرموودەیەکی سەحیحی موسلیم باس لەوە دەکات کە کۆمەلێك چەکدار بەبیٚ ئاگایی ویستویانە پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بکوژن ،بەڵام ئەوانیان بەدیل گرتووەو دواتر بیٚ بەرامبەر ئازادی کردوونە[2]

---

١- صحيح مسلم ١٣٨٦/٣، ( ١٧٦٤ )

٢- (( صحيح مسلم ١٤٤٢/٣/ ( ١٨٠٨

هەروەک ئەنەسی کوری مالیک دەگێڕێتەوە (( أَنَّ ثَمَانِينَ رَجُلًا مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ هَبَطُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ جَبَلِ التَّنْعِيمِ مُتَسَلِّحِينَ، يُرِيدُونَ غِرَّةَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ،فأخذوا أخذا ،فأعتقهم رسول الله )) [1] واتە:

هەشتا کەس لە چیای تەنعیم و لەکاتی نوێژی بەیانی بەسەر پێغەمبەرو یارانیدا هاتنە خوارەوەو دەیانەویست بیکوژن، بەلام ئەوان گیران جا پێغەمبەر درودی خوای لەسەر خۆی ئازادی کردن. ئەو روداوە تەنها روداوێکی سادەنیە چونکە ئەوانەی هاتوونە هەشتا کەس بوونە لەبێ ئاگاییش ویستوویانە بەسەر سەردارو یاوەرانی دادەن، کەچی دەستگیر دەکرێن و دواتریش ئازاد دەکرێن..

نمونەیەکی دیکە لە ئازاد کردنی دیل ئەوەیە کەچۆن (( باگووت گلوب )) رۆژهەلات ناسی ئینگلیزی کەماوەیەکی زۆر لەئوردەن ژیاوە و لەسەردەمی ئینتیدابی بەریتانی چەندین پلەی سەربازی لەو ولاتە وەرگرتوە، تا دواجار بۆ ولاتکەی خۆی دەرکراو، لەسالی ( ١٩٨٦ ) کۆچی دوایی کرد،

---

١-سنن الترمزي ٢٣٩/٥ ( ٣٢٦٤ )

لەکاتی چونەوەی بۆ بەریتانیادەستی دایەنووسین دەربارەی ئیسلام و عەرەب وەکو سەرچاوەیەکیش تەماشا دەکرا، له کتێبێکیدا دەربارەی فتوحاته گەورەکانی عەرەب وێرای ئەوەی ژاری دەکاتە ناو نوسینەکانی، بەلاَم لەگەڵ هەموو

ئەمانەشدا لەکاتی قسەکردنی دەربارەی سەرداری مرۆڤایەتی دا دان به هەندێك راستی و هەقیقەتدا دەنێت.

بۆ نمونه لەشەری حونەین دەربارەی سەرکەوتنی موسلمانان بەسەر هەوازندا باس له دەسکەوتەکانی موسلمانان دەکات جا دەلێت: هەروەك ژمارەیەکی زۆریان لێ به دیلگرتن، زۆربەیان ژن و منداڵ بون جاکاتێك پێغەمبەر درودی خوای لەسەر گەراوه بەبێ ئەوەی بتوانێ فەتحی بکات...

شاندێکی هەوازنی دۆراو هاتنه لای تکایان لێ دەکرد ژن و منداڵەکانیان له دیلی رزگاربکات، پێغەمبەریش هەربه خێرایی بەپیل داواکەیان هات بەو پێ یەی به نەرم و نیانی و تەساموح و لێبوردەیی ناسراوه جا جارێکی دیکەو له لوتکەی سەرکەوتنی سەر له نوێ هەولی دەدا زیاتر دڵی خەلك وەدەست بهێنێت نەوەك پەنا بۆ سزادان و تۆڵەسەندنەوەبکات. (١)

---

١- (( الفتوحات العربية الكبري/١٤٤ ))

دواتریش کەشاندی هەوازن و موسلمان دەبن، سەردارمان بەدوای گەورەیان مالیکی کوری عەوف دەنێرێت وموسڵمان دەبێت و هەموو شتەکانی بۆ دەگێرێتەوە جائەویش شیعرێك دەنوسێت و لە دێری یەکەمیدا دەلێت:

« ما إن رأيت. ولاسمعت بمثلة.......

في الناس كلهم بمثل محمد......»[1]

واتە: نەم دیتووەو نە مبیستووە لە ناو خەلکی بە تێکرایی هاوشێوەی محمد هەبێت.لەسەروی هەموو ئەمانەشەوە دەبینین سەر سەختترین دوژمنی ئەو سەرداره قورەیشیەکانی مەککە بوون بەڵام کاتێك دەسەلاتی گرتە دەست و، فەتحی مەککەی کرد لە بری تۆڵە سەندنەوە بریاری لێبوردنی دەرکرد، تا دواجار هەموان هاتنە ژێر سێبەری لێبوردنەکە لە وەحشی بکوژی ئیمامی هەمزەوە بگرە تا دەگاتە هیندی ژنی ئەبوو سوفیان، کە جەرگی ئیمامی هەمزەی خوارد..

ئەمەرای جمهوری زانایانی فیقهی ئیسلامیە کە دروستە دیل بێ بەرامبەر ئازاد بکرێت[2]

---

١- دلائل للنبوة للبيهقي ١٩٨/٥

٢- (( قوانين الاحكام الشرعية/١٦٦ /المهذب للشيرازي ٢٣٧/٢ المغني لابن قدامة ٤٠٠/١٠-٤٠١ ))

ئەوانەش کەدەڵێن: نابێ دیل بێ بەرامبەر ئازاد بکرێت بە پشت بەستن بەو ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت ( فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ )[1]

واتە: موشریکان بکوژن لە هەر شوێنێک پێیان گەیشتن.

ئەمە رایەکی لاوازە چونکە ئەم ئایەتە باسی حالەتی جەنگە دژی ئەو موشریکانەی پەیماتیان شکاندووەو پشتیوانیان بۆ دژایەتی موسلمانان کردووە.

واتە ئەگەر کەوتنە شەر لەگەڵ ئەو موشریکە پەیمان شکێنانەی پشتگیری دوژمنداری ئێوە دەکەن ئەوا لە هەر شوێنێک پێیان گەیشتن بیان کوژن، کەواتە ئەگەر بوونە دیل و کەوتنە دەستتان ئەو حوکمە نایان گرێتەوە چونکە چەندین نمونەی موشریکانمان لە سەرەوە هێناوە کە بە دیل گیراون، دواتر پێغەمبەری خوا بێ بەرامبەر یان بە بەرامبەر ئازادی کردوونە..

---

١- سورەتی التوبە ئایەتی ( ٥ )

## دووەم : بە بەرامبەر

جۆرێکی دیکە لە مامەڵەی پێغەمبەری سەردار لەگەڵ دیلەکانی جەنگ ئازاد کردنی بە بەرامبەر بوو وەک لە ئایەتی سەرەوە روون کرایەوە کە خوای مەزن دەفەرمووێت ﴿.....فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً....﴾ [(١)] ئەمەش بەو شێوازە بوو ئەو کەسەی دیل بوو بریاری ئازاد کردنی بۆ دەر چوو بەلام هەندێک شتی لەسەر بوو پێویستە لە بەرامبەر ئازاد کردنی ئەنجامی بدات ئەمەش چەند جۆرێکی هەیە..هەندێکیان ئازاد دەکرێن لە بەرامبەریان ماڵ وەردەگیرێت وەک ئەوەی لە شەری بەدر روویداو لە بەرامبەر دیلە کان ماڵ وەرگیرا،وەک ئبنو عباس دەگێرێتەوە (( فادي النبی بأساري بدر ، فكان فداء كل واحدٍ منهم أربعة ألاف ))[(٢)] واتە: پێغەمبەر درودی خوای لەسەر گۆرینەوەی بە دیلەکانی بەدر کردهەر یە کێکی بە چوار سەد تا چوار هەزار گۆریەوە. هەندێکیش لە بری پارە دیل بە دیلیان گۆریەوە وەک عیمرانی حوصەین دەگێرێتەوە (( ان النبی فدي رجلین من المسلمین برجل من المشركین من بنی عقیلٍ )

---

١- سورەتی محمد ئایەتی(٤)

٢- مصنف عبد الرزاق الصنعاني٥/٢٠٥ ( ٩٣٩٤ )

٣- مسند احمد بن حنبل ٦١/٣٣ ( ١٩٨٢٧ )

واتە: پێغەمبەر دوو کەسی موسلمانی لەگەڵ کەسێکی موشریکی بەنی عوقەیلی گۆڕیەوە.ئەگەر جوانتر وردبینەوە دەبینین رێگاکانی ئازاد کردنی دیل زۆرن، ئەوەش بۆ ئەوەی زیاتر دەرفەت بدرێتە ئەو دیلانە تا ئازاد بن هەر بۆیە ئەگەر دیلێک پارەی نەبا یان کە سێک نەبوو دیلی لە بەرامبەر دا بگۆڕێتەوە ئەوا دەکرێ کارێکی پێ بسپێردرێت، واتە ئەو کەسەی مالی نییە، یان کەس گۆرینەوەی پێ ناکات، ئەگەر بێ بەرامبەر ئازاد نەکرا وەک لە خاڵی پێشتر باسمان کرد، ئەوا دەرفەتێکی دیکەی دەدرێتە پێش ئەویش ئەنجامدانی کارێکی خزمەتگوزارییە، جا پیشەیی، پەروەردەیی، زانستی، ئابوری یان هەر جۆرێکی دیکە بێت، کە خزمەت بکات[1] وەک ئیبنولقەیم باسی دەکات: (( وفادي بعضهم علي تعليم جماعةٍ من المسلمين الكتابة ))[2] واتە: هەندێکیشی ئازاد کردن لە بەرامبەر ئەوەی کۆمەلە موسلمانێک فێری نووسین بکەن.ئەوانەش کە پێیان وایە دروست نییە بە هیچ جۆرێک دیل بنێردرێتەوە، دیسان پێچەوانەی راستیە کانی ئیسلامە چونکە ئەوە ئایەتی قورئان تەنها باسی ئازاد کردنی دیل دەکات ئەوەش پێغەمبەری ئیسلام بە شێوەی کردەیی جێبەجێی کردووە ئەگەر ترسیشیان ئەوە بێت گوایە ئەگەر دیل ئازاد بکرێت

---

١- (( الجهاد والقتال في السياسة الشرعية ٣/١٥٤١-١٥٤٢ ))

٢- زاد المعادفي هدي خير العباد ٥/٦٠

ئەوا دەگەڕێتەوە ریزی دوژمن و لەوانەیە جارێکی دیکە بگەڕێتەوە مەیدانی شەرکردن، بەلام دەبینن هیچ لەم ئەگەرانە رێگرنە بوونە لەوەی پێغەبەری خوا دیل ئازاد بکات تا ئەوەبوو ئەبوعەزەی لە شەری بەدر ئازاد کرد، کەچی لەشەری ئوحود هاتەوە و کوژرا..

هەروەها کاتێك دەگووترێت دیل ئازاد دەکرێت، مانای وا نییە هەر لەو کاتەی دەستگیر کرا ئازاد بکرێت، نەخێر...کاتی ئازاد کردنەوەی بەوە دەبەسترێتەوە، کە بەرژەوەندی دەوڵەتی تێدابێت لەوانەیە پێویست بکات دواى ماوەیەکی کەم یان زۆر ئازاد بکرێت چونکە خوای گەورە دەفەرموویێت:﴿....حتى تضع الحرب أوزارها...﴾[1]

واتە: شەر بکەن و دیلەکان راگرن دواتر بە بەرامبەریان بێ بەرامبەر ئازادیان کەن- تا جەنگ قورساییەکانی دادەنێت..یەك لەماناکانی ئەم ئایەتە کەدەفەرموویێت جەنگ قورساییە کانی دادەنێت، واتە: چەك هەلبگیرێتەوەو دوژمن ببەزێت.بەومانایەی ئەو کاتە مەسەلەی دیل گۆڕینەوەو ئازادکردن دەست پێدەکات، کە جەنگ کۆتایی پێ هاتووە، کە واتە کۆتایی کاتەکە پەیوەستە بە بەرژەوەندی دەوڵەت، چ کاتێکی پێ باش بوو ئەوە هەلدەبژێریت..

---

١- سورەتی محمد ئایەتی (٤)

هەتککردنی دیل مەبەست ئەوەیە بە شێوازێکی نەشیاو نمایش بکرێت وەك ئەوەی گوێ و چاو ولووتی لێ بکرێتەوە..

کاتێك بەوردی تەماشای دەقەکانی فەرمووده پیرۆزەکانی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر دەکەین دەبینین کۆمەڵە دەقێکی روون و ئاشکرا هەن رێگە لە هەتککردن دەگرن، واته بەر لەوەی دوژمن بکە وێته بەردەست ئەگەر هەتکیش کرا گوناهی تێدانییە وەك ئەوەی تۆپێك بۆریزەکانی دوژمن رەوانە دەکەیت لە وانەیە لەو کاتە ساچمەیەکی تۆپە کە گوێی کەسێك بپەرێنێت، ئەوە لە دەسەلاتی تۆپهاوێژەکە نییە بەلام ئەگەر کەسەکە کەوتە بەر دەست و بووە دیل ،ئەوە دروست نیە هیچ لاشەی هەتك بکرێت، تا ئەوەی یەکێکی وەك زەمەخشەری دەفەرمووێت: هیچ راجیاوازی نیە لەوەی هەتککردن حەرامە هەروەها خاوەنی ( سبل السلام ) دەفەرمووێت: زێدەرۆیی لە دەستکەوتەکان حەرامە، غەدر حەرامە، هەتککردن حەرامە، کوشتنی مندالی موشریکان حەرامە،ئەوانە بە ئیجماع حەرامن [1] خۆ ئەو قسانە هەموویان بۆ ئەو بەڵگە بە هێزانە دەگەرێتەوە کە هەتککردن حەرام دەکەن، وەك:

---

١-(( تفسير الكشاف ٢/٦٤٥ سبل السلام ٢/٤٦٧ ))

١-ئیمامی موسلیم فەرموودەیەک دەهێنێتەوە « كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَمَّرَ أَمِيرًا عَلَى جَيْشٍ ، أَوْ سَرِيَّةٍ ، أَوْصَاهُ فِي خَاصَّةِ نَفْسِهِ بِتَقْوَى اللَّهِ ، وَبِمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْرًا ، ثُمَّ قَالَ : " اغْزُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ، قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ ، لا تَغُلُّوا ، وَلَا تُمَثِّلُوا ، وَلَا تَقْتُلُوا وَلِيدًا [(١)]. واتە: پێغەمبەری خو درودی خوای لەسەر ئەگەر کە سێکی دەکردە ئەمیری لە شکرێک یان سریە یەک وەسیەتی دەکردبۆ خۆی تەقوای خوای هەبێت و بۆموسلمانانی لەگەڵی چاک بێت پاشان دەیفەرموو بجەنگن بە ناوی خوا لە پێناوی خوا شەر لەگەل ئەوانە بکەن کافرن بە خوا..

بجەنگن و زێدەرۆیی مەکەن، غەدرمەکەن، هەتک مەکەن، هیچ منداڵ مەکوژن..ئیمامی شەوکانی دەفەرمووێت: کە فەرمووی: « ولا تمثلو » هەتک مەکەن، بەڵگەیە کە هەتککردن حەرامە.هەر بۆیە کاتێک هەندێک لە زانان دەفەرموون: هەتککردن مەکروهە، دەڵێن: مەبەستیان کەراهەتی تەحریمیە چونکە زۆر لەزانایانی سەلەف مەکروهیان بۆ حەرام بە کارهێناوە هەرچەندە ئەوبابەتە جیایەو من رای ترم لە سەری هە یە بەڵام نقلەکان بەهێزە

---

١-((صحیح مسلم ٣/ ١٣٥٧/ ١٧٣١

٢- عەبدولای کوری یەزید دەگێڕێتەوە (( انهُ نهي عن النهبة والمثلة ))(١)

واتە: پێغەمبەری خوا درودی خوای لەسەر نەهی لە تالآن کردن و هەتککردن کردووە..

٣-لە عیمرانی کوری حوصەین و سومرەی کوری جوندوب دەگێڕێتەوە:

{ كان رسول اللّه (ص) يحثنا علي الصدقة وينهانا عن المثلة }(٢) واتە:

پێغەمبەری خوا درودی خوای لەسەر لەسەر خێرکردن هانی دەداین هەتککردنیشی لێ قەدەغە دەکردین..

٤- سەبارەت بەوەی لەشەری بەدر عەبدولای کوری مەسعود سەرێکی بۆ پێغەمبەر هێناوە ئیمامی زوهری دەفەرموویێت:

{ لَمْ يُحْمَلْ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأْسٌ قَطُّ ، وَلَا يَوْمَ بَدْرٍ، وَحُمِلَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ رَأْسٌ ، فَأَنْكَرَهُ }(٣)

---

١- صحيح البخاري ٧/ ٩٤/ ٥٥١٦

٢- سنن ابي داود٤/٣٠١/ ٢٦٦٧

٣- المعجم الكبير للطبراني ١٢/٢٨٩/ ١٣١٤٣/ المراسيل لابي داود /٢٤٥ /سنن سعيدبن منصور ٢/ ٢٨٨/ ٢٦٥١

واتە: هیچ سەرێکیان بۆپێغەمبەر نەهێناوە، لە رۆژی بەدریش هیچ سەرێکیان نە هێناوە، سەرێکیان بۆ لای ئیمامی ئەبوبەکر هێنا ئینکاری کرد، یەکەمین کەس کە سەریان هێنایە لای.عەبدولای کوری زوبەیربوو .هەروەها ئەبوداود دەربارەی لێکردنەوەی سەرو نمایش کردنی دەفەرمووێت: { لایصح منها شيء }[1] واتە: لەو بارەیەوە چەند حەدیسێك لە پێغەمبەرەوە هاتووە کە هیچیان صەحیح نینە .پوختەی ئەم باسەمان بریتیە لەوەی ئەم باسە بە پێی رۆژگار دەگۆرێت هەرشتێك ببێتە مایەی هەتککردن و سوکایەتی پێکردن حەرامە، جا سوتان بێت یان سەر برین بێت یان نمایشکردن بێت لەسەر تەلەفزیۆن و ئەنتەر نێت، چونکە لە رۆژگاری ئەمرۆماندا لەسێدارەدان بەرێگای ئاسانتر و خێرا تر هەیە، پێغەمبەریش تەئکیدی لەسەر چاکە کردوە لە کاتی کوشتن دا.لێرەدا حەزدەکەم جارێکی دیکە بە بیرخۆمانی بێنینەوە، کە مەبەست لەم بابە تانە کە سێکە تاوانباری جەنگ بێت نەك دیلێکی ئاسایی، یان موسڵمان و نا موسڵمانێك شەریان پێ فرۆشرایەو دیفاع لە خۆیان دەکەن ئەوان بە یچ جۆرێك ناچنە ژێر ئەو باسەوە چونکە هێرشکردنە سەریان و گرتنیان و لێدانیان هەر لە بنەرەتدا حەرامە..

---

١-المراسيل/ ٢٣٠ /٢٩٦

لە بەرامبەر ئەو فەرموودانەی هێنامانەوە چەند دەق و بەسەر هاتێک هەن زۆرجاران وەکو بەڵگەی هەتککردن و سوتاندن باس دەکرێن: بۆ نموونە:

١-بەسەر هاتی ( عورەینە ) کاتێک کۆمەڵە کە سێک دێنە لای پێغەمبەر درودی خوای لەسەر جۆرە نە خۆشیەکیان هەیە ئەویش وەک حالە تێکی تایبەتی ناچار بەو کەسانە چەند حوشترێکیان بۆ دەست نیشان دەکات « شیر و میزەکەی » تێکەڵ دەکەن وچاک دەبنەوە پاشتر ڕێگە بە کەسی دیکە نەدراوە بۆ ئەم شتە دوای چاک بوونەوە لە دین هەڵدەگەڕێنەوە و دەدزن..

کاتێک پێغەمبەر هەواڵەکەی دەزانێت بە دوایان دەنێرێت،چیان بەسەر شوانەکە هێنابوو بەسەریان دێننەوە..

هەندێک ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە بەوەی دروستە ئەوەی دوژمنان بەسەرت دێنن بەسەریان بێنیەوە بەڵام ئەمە ناکرێتە بەڵگە، چونکە:

ئەم فەرموودەیە لە صەحیحی بوخاری هاتووە بەڵام وادیارە ئیمامی بوخاری لەگەل ئەوە دانەبوە پشت بەم روداوە ببەسترێت و پێی وابووە دواتر ئەم شتە نەماوە هەربۆ یەش دەبینین ئیمامی بوخاری راستەو خۆ دوای گێرانەوەکە فەرموویەتی:

« قال قتادة فحدثنی محمد بن سیرین: ان ذالک کان قبل ان تنزل الحدود »

واتە: ئەم بریارە پێش ئەوە بووە کە ( حەد ) ی شەرعی داببە زێت یانی دواتر ئەمە نەما

* دیسانەوە ئیمامی بوخاری لەگەڵ ئەم بەسەر هاتە دەفەرمووێت: (( قال ابو قلابة: هولاْ قوم سرقو وقتلو وكفرو بعد ايمانهم وحاربو ا اللّه ورسوله ))

واتە: ئەوانە خەلکێك بوون ئیمانیان هێنا پاشان دەستیان دایە دزین و کوشتن و کافربوون و دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی(( موسلمانان)) واتە: ئەوە قیصاص بووە، ئەوەش زیاتر ئەو چە تانە دەگرێتەوە کە هێرش دەکەنەسەر خاك و ماڵی خەلك و خەلك دەکوژن[1] دەکرێ بگوترێت ئەم روداوە لەسەرەتا دابوە دواتر قەدەغە کراوە. واتە حوکمە کە مەنسوخە یان قیساس بوە

ئیمامی بوخاری هەر خۆی لە صەحیحە کەیدا دەفەرمووێت: (( عن النبى (ص) انه نهي عن النهبة والمثلة ))[2]

---

١-(( صحيح البخاري ١٢٣/٧/ ٥٦٨٦/ و ١٦٣/٨/ ٦٨٠٥ ))

٢-(( الحاوي الكبيرفي فقه مذهب الامام الشافعي للماوردي ١٧٥/١٤

رایەکی دیکەی راڤەکارانی قورئان پێیان وایە پێغەمبەر درودی خوای لەسەر ویستی وەکو شوانەکەیان لێبکات بەلام دواتر تەنها فەرمانی کوشتنی بەسەردان و ڕێگەی هەتککردنی نەدان [1] کەواتە هەزوو زانایان وەلامی ئەم بەڵگەیان داوەتەوە، بۆیە پشت بەو فەرموودەیە نابەسترێت.

خۆ ئەگەر گریمان شتێکی واکرابێت ئەوا دەر هەقی هەندێک چەتەی ڕێگربووە، نەگ دەر هەقی دیل و کەسانێک کە دیفاع لە خۆیان دەکەن.

٢- دەڵێن: لە کاتی شەری یەمامە خالیدی کوری وەلید لە جەنگدا هەندێگ هەلگەراوەی گرتن و ئاگری تێبەردان.

بەلام ئەم قسەیەش رەتدەکرێتەوە چونکە گێرانەوەکە وای پیشان دەدات، کە ئەو کاتی ماوەیەکی زۆر بەسەر موسلمان بونی خالید تێپەرٍ نە ببوو بۆیە حوکمەکەی نازانی،هەربۆیە ئەبوبەکرو عومەر دژی ئەم کارە وەستانەوەو خۆیان لیٰ بەریکرد بەلام راستیەکەی ئەوەیە ئەم روداوە هەر راست نیە و( باطلە) وەک لە روونکردنەوە کەی خانەی فەتوای میسری هاتوە،

---

١- (( جامعا البيان في تاويل القران ( تفسيرالطبري ١٠ /٢٤٣ )

٢- (( الحاوي الكبير في فقه مذهب الامام الشافعي للماوردي ١٤/ ١٧٥))

چونكه یەكێك لەوانەی له زنجیرەی گێرانەوەكه هاتوه ناوی ( محمد بن حمید الرازي ) یه ئەو كه سێكی درۆزنه، ئیبن حیبان له بارەیەو دەفەرموویێت :

(( كان ممن ینفردعن الثقات بالا شیاْ المقلوبات )) هەروەها ئەبو زورعەو محمدی كوری موسلمی كوری واره دەفەرموون: لای ئیمه راست دەرچوه كه كەسێكی درۆزنه..جا روداوێك بێت درۆزنێك بیگێرێتەوه چۆن بۆ حوكمێكی شەرعی پشتی پێدەبەسترێت،

٣- دەڵێن: ئەبوبەكری كەسێكی سووتاندووه به ناوی (الفجأءة السلمي)

دیسان خانەی فەتوای میسری روونی كردیتەوه كەئەم بەسەرهاته بەتاڵ و ناراسته چونكه مەداری سەنەدەكەی لەسەر {علوانی كوری داودی بەجەلی} یه ئەویش حەدیسه كانی مەطعونن..

به مونكەرو لحەدیس و لاواز وەسف كراوه وەك له دەقەكەی دەڵێن: ( لان روایة احراق ابي بكرالصدیق للفجاْءة روایة باطلة مدار سند ها علي علوان بن دود البجلي" وهو رجل مطعون فی روایتة، قال الحا فظ بن حجر فی لسان المیزان:" قال البخاري علوان بن داود – ویقال ن صالح – منكر الحدیث كما علق الحافظ نورالدین الهیثمي فی مجمع الزوائد علي هذه الروایة بقوله :واه الطبراني وفیه علوان بن داود البجلي وهو ضعیف وهذا الأثر  مما أنكر علیه

"وروي العقيلي فى الضعفاء الكبير ، عن يحيى بن عثمان أنه سمع سعيد بن عفير يقول : كان علوان بن داود زاقولي من الزواقيل " والزواقيل هم اللصوص )

خۆ ئەگەر گریمان ئەوانە راستیش بن پشتیان پیٚ نا بەستریٚت چونکە یەك لە بنەماکانی ئوسولی فیقهی ئیسلامی دەربارەی قەولی صەحابی ئەوەیە کە قەولی صەحابی دەلیلی مولزیم نیە،هەروەها مەرجە نا بیٚ صەحابەی دیکە موعارەزەیان کردبیٚت، ئەم روداوانە ویٚڕای ئەوەی راست نینە بەلام هاتوشە کە صەحابەی دیکە موعارەزەیان کردوە وەك ئەبوبەکرو عومەر بۆ خالید، هەروەها ئیبن و عەباس بۆ ئیمامی عەلی..

٤- هەندیٚك ئایەتی ( فَإِذا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ )[1] دەکەنە بەلگە، بەڵام لە پیٚشەوە. رونمان کردەوە کە ئەوە تایبەتە بە بەرەی جەنگ و زیاتر بۆ هاندان و ورە بەرزکردنەوەیە..

٤- هەروەها کە پیٚغەمبەر(ص)دەفەرموویٚت: ( لقد جئتكم بالذبح )[2]

---

١-سورة محمد الاية ٤

٢-هذا الحديث رواه أحمد في " المسند " (٦٠٩/١١) طبعة مؤسسة الرسالة من رواية الصحابي عبد الله بن عمرو بن العاص رضي الله عنهما ، وحسنه المحققون ، والشيخ أحمد شاكر في تحقيق المسند أيضا ، وحسنه الهيثمي في " مجمع الزوائد " (١٩/٦) ، وكذا الشيخ الألباني في " صحيح الموارد " (١٤٠٣).

٥- مەبەستی سەربڕین نییە چونکە لەزمانی عەرەبی ( ذبح) بە مانای کوشتن دێت وەک خوای گەورە باسی فیرعەون دەکات:﴿ يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ﴾ [1]

٦- لیرە دا ذبح بەمانا کوشتنە نەک کوشتنەوە،لەسەردەمی خۆی ئاسانترین شێواز بۆکوشتن و کەمترین ئازار پێدان سەربڕین بووە چونکە بە یە ک جار بە تە ورێک یان شمشێرێک لە ملی کە سە کە یان دە دا روحی دە ردە چ نەک وەک ئە م سەربڕینە ی ئیستا کە وە کوو  چون ئاژەل سەردەبری ، مەبەستی پێغەمبەریش جۆرە موعجیزەیەکە، چونکە لە مەککە ئەو قسەی فەرمووکە هێشتا لەبن دەستی قورەیشیەکان بوو،یانی هەرەشەی لێدەکەن کە ئێوە لە داهاتوو دا دەکوژرێن نەک دەتان کوژمەوە فەرمایشتەکەشی راست دەرچوو ئەوان هەموویان کوژران.

٧- هەندێکی دیکە پشت بەو ئایەتە دەبەستن کە دەفەرموویێت: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ﴾ [1] بەلام ئایەتە وێرای ئەوەی گفتو گۆی زۆری لەسەر کراوە،بەلام هەرچۆنێکی قسەی لێوە بکرێت ئەو ئایەتە پێچەوانەی کاری سەربڕین و سووتاندنە .

---

١- سورة البقرة (٤٩)

٢- سورة نحل ( ١٢٦)

چونکە ئایەتەکە باس لەوەدەکاتبە جوانترین شێوە گفتو گۆیان ڵەگەڵ بکەن، بەلأم ئەگەر خراپەیان بەسەر هێنان ئەوا سزایان بدەن بە وێنەی ئەوەی سزا دراون، خۆ ئەگەر ئارام بگرن و تۆڵە نەستێننەوە ئەوە بێگومان بۆ ئارامگران باشترە..دەڵێن: دوای ئەوەی لاشەی ئیمامی هەمزەیان هەتککرد پێغەمبەر درودی خوای لەسەر تورەبوو بریاری تۆڵەی پەنجا کەسی دا، بەڵام ئەم ئایەتە دابەزی و، ئاگاداری کردەوە ئەگەر تۆڵەش بکەیتەوە ئەوە لەسنوری عەدالەت تێنەپەری، بەڵام ئەگەر لەکاتی توانا و دەسەلاتتان ئارام بگرن و تۆڵە نەکەنەوە ئەوە باشترە..

هەر بۆیەش پێغەمبەر درودی خوای لەسەر لێبوردنی هەلبژارد،وەحشی بکوژی مامی ( حمزەی پالە وان سەرخەری دین ) وە هیندی جەرگ خۆریشی ئازاد کرد. کەواتە ئەخلاقی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر هیدایەتە نەك لووت و گویٚ برین..

ئەوەیە وای لە مەلای کورد کردوە سەر سورمانی خۆی لەو هەموو سەبرو ئارامیەی پێغەمبەر دەرببرێت بەرامبەر ئەو هەموو سزایەی بەسەریان داهێنا ، بەکورتی بەڵگەکان هیچیان پەیوەندی بەو کارەنیە کە دیلێکی موسلمان سەر ببریت یان بیسوتێنیت،

یان نا موسلمانێکی بێ تاوان بەو حاڵە ببەی. ماوە ئاماژەیەك بەوە بکەین کە ئەو ئیختیلافەی هەندێك لە عولەمای ئیسلام هەیانە داخۆ هەتککردنن دروستە یان نا مەبەستیان ئەوەیە ئەگەر لەگەڵ کافرێکی حەربی، کە ستەمت، لێ دەکات، لەوکاتیش دروست نیە هەتکی بکەی، بەڵام ئەگەر ئەوان موسلمان یان هەتك کرد دروستە بەرامبەر بەوە تاوان بارەکە هەتك بکە نەوە، بەڵام لەوکاتیش هەتك نەکردن باشترو پەسندتر..

کەواتە: هەتککردن حەرامە، چ وەکو ئەو رایە بەقووەتەی بە هەموو شێوەیەك حەرامی کردوە.

چ وەکو ئەو رایەی دووەم کە دەڵێت: لەکاتی قیصاص رێ ی تێدەچێت، ئەوانیش رایان وایە دەبێ حاکمێکی موسلمان ئەو بریارە بدات بە شێوازێك خزمەتی موسلمانانی پێ بکات..

ئەو رایە هەر چەندە لاوازەو هیچ خزمەتێك بە موسلمانان و مرۆڤایەتی ناکات،

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە ناگرێتەوە کە ئەمرۆ تیرۆریستان دەیکەن،

چونکە ئەوان تاوانبارن کە شەرێکی بە ناحەقیان لە ناو جەرگەی موسلمانان هەلگیرساندوەو بوونە مایەی شەهید بوونی هەزاران تاکی موسلمان و وێران و خاپور بونی مالیان و ئاوارە بوونی ملیۆنان موسلمان.

بۆیە ئەوانن دەست درێژی دەکەن بۆ سەر

{ گیان و ماڵ و ناموس و نەسلی }موسلمانان، بە هیچ شێوەیەک مافی ئەوەیان نیە ئەم دەقانە بۆخۆیان بەکاربێنن.

لە کۆتایی دا دەگەینە ئەو ئەنجامەی، کە کوشتنی دیلێکی کافری موحاریبی دەستدرێژیکار حەرامە ، مەگەر تاوان باری جەنگ بێت و بەرژەوەندی موسلمانانی تێدا بێت.کە دەکرێتە دیلیش نابێ هیچ سوکایەتی پێبکرێت. نابێ بە ئیهانەوە لەسەر شاشەکان نمایش بکرێت بە تایبەتی بەسەر برین و سوتاندن...

ئەمە ئەگەر بۆکافرێکی جەنگی دەستدرێژیکاربێت ، نەوەک موسلمان بێت..

ئەوە بەهیچ شێوەیەک ئەو واقیعەی ئیستا ناگرێتەوە، کە کورد موسلمانە... دەستدرێژی نەکردوە... نە چۆتە سەر ماڵ و حالی کەس... تەنها وەکو ئەرکێکی ئاینی و نیشتیمانی دیفاع لە خۆی دەکات...بۆیە شەڕ فرۆشتن بە کورد... خاک داگیر کردنی... بەدیل گرتنی هەر لە بنەرەتدا حەرامە،وە بە پێچەوانە وەش کوردیش بۆی نیە دەستدرێژی بۆهیچ کەسێبکات مال و حالی کەس داگیربکات ..              کۆتایی ...

## السلام عليكم ورحمة اللة

**تێبینی ١**

**ئەم لێکۆڵینەوەی بەر دەستت لەپاشی شەش ساڵ خەریکە بڵاودەبێتە وە تەنانەت تۆزیک دەسکاریم کردوە کە لەگەڵ بارودۆخی ئیستا بگونجێ .**

**تبینی ٢**

**ئەمرۆ تێگەیشتنی من وایە بۆ دەقە کانی شەریعەت چ قورئانی پیروز یان فەرموودەی شریف نازانم زانستی من بەیانی دەگا بەکوێ لەم بابە تە !!**

**ملا زانا خەیام**

**٢٠١٦-١-٢٦**

**سوپاس و پێزانین....**

**بۆئه‌ندامانی رێکخراوی باوه‌ریو که‌لتوری**

**بۆماموستاکانم که‌رۆژیك وانه‌یه‌کی شه‌ریعه‌تیان پێگتوم .**

**بۆکۆمسیونی توێژینه‌وه‌و دیراساتی رێکخراوه‌که‌مان .**

**بۆبه‌رێز سیماعمر که‌زور به‌تایپ کردنی ئه‌م بابه‌ته سه‌رقال بوو.**

**بۆهه‌موو ئه‌وانه‌ی که‌له‌بیرم ناچنه‌وه .**

**سوباس و پێزانین بۆکاك سالار هه‌ولێری**

**له بسم اللّٰه ی ئه‌م بابه‌ته له‌گه‌لم بوو .....**

**وه‌به‌تایبه‌ت سوپاس بۆ ئه‌و که‌سانه‌ی که تێم ده‌گه‌ن.**

# مافی لەچاپ دانی پارێزراوە

# بۆ

ڕێکخراوی باوەڕ و کولتووری

لەبڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی باوەڕیو کەلتوری

نوسەرانی ڕێکخراوی باوەڕیو کەلتوری

*ملاکاروان کەسنەزانی

*ملا احمد هادی نوغرانی

* ملا لاوند چوارباخی

*ماموٚستا سیما عمر

*ماموٚستا بیان

*ماموٚستا شیلان محمد

بەرێوەبەری گشتی

ماموٚستا ملازاناخەیام

مرۆڤ ژیانی بە مرۆڤ نە داوە
هەر بۆیە حەقی نیە
ژیانیشی لێ بستێنی

یە کەم تاوان کە ئا دەمیزاد کردی
- لەسەر گۆی زەوی خوێن ڕشتن بوو..
- بۆیە دایکی تاوانە کانە ..

مرۆڤ بۆ ژیان دروست کراوە
نەوەك ژیان بۆ مرۆڤ..

مامۆستا زانا خەیام

٢٠١٦